تصوير أبو عبد الرحمن الكردي
کورد و کێشەی (کەرکووک)
ڕەخنە و کۆڵینەوە
حوسێن محەمەد عەزیز
2705ک /2005ز
www.iqra.ahlamontada.com
منتدى إقرأ الثقافي

# کورد و کێشەی
# « کەرکووک »

« ڕەخنە و کۆلینەوە »

حوسێن محەمەد عەزیز

2705ک/2005ز

بۆ هەمـوو ئەو کـوردە ڕەوشت بەرزانەی، بە ڕاشکاویی دەنووسن، سڵ لە کـەس ناکـەن، بە مـوو لە ڕاسـتـیی لا نادەن، زمـان و پێنووسیان خاوێنە، سووکایەتی بە خۆیان و پێنووسەکانیان ناکەن، لە پێناوی پارە و دەسەڵاتدا، خۆیان و پێنووسەکانیان نافرۆشن، لە پاڵ هیچ لایەنێکدا، خـۆیان حـەشـار نادەن، جگە لە ڕۆڵەکـانی گەل، هیچ پشت و پەنایەکیان نییە، باوەڕیان بە خۆیان هەیە و مەبەستی سەرەکییشیان، تەنیا هەر، ڕازەی کۆمەڵانی خەڵکە!

# ـ نـــــــاوەڕۆک ـ

# پێشـــــــەکیی

لە سەرەتای مـانگی « فێبرەوەری »یەوە، تا کۆتایی مـانگی « دیسـێمبەر »ی سـاڵی « 2004 »، واتە: لە مـاوەی دە مانگدا، پتر لە هەشتا گوتاری کورت و درێژ، بابەتی « نەتەوەیی، رامیـاریی، کۆمـەڵایەتیی، زمانەوانیی و وێژەیی »م نووسـیوە. هێندێکیـان بڵاوکـراونەتەوە و هێندێکی دیکەشیـان، هێشـتـا بڵاو نەکراونەتەوە و لە سەرەدا وەستاون.

بەشێ لەو گوتارانەم، لە پەرتووکی « برایەتی درۆزنانە »دا چاپ و بڵاوکردەوە. ئەوا ئەوڕۆش، دووەمین بەشی گـوتارەکـانم، لەم بەرهـەمـە نوێیـەدا چاپ و بڵاودەکەمەوە. کاتی خۆی، هەموو ئەم گوتارانەم، لە لاپـــەڕەی ئەلیکترۆنیی « **Kurdistanpost** » و لە گۆشـەی « گـوڵبژێر »دا، هەفتانە، بە شـێوەیەکی بەردەوام و رێکوپێک بڵاوکـردۆتـەوە. بەو هیـوایەی، سـاڵی ئاییندە بتـوانم، بەشـەکـانی دیکەش، لە دوو توێی بەرگێکی جوان و رازاوەتردا، پێشکەش بە خوێندەوارانی هێژای نەتەوەکەم بکەم.

لەم پەرتووکە نوێیەدا، گوتارەکانم، بەپێی بابەتەکان و نزیکییان لە یەکدییەوە، پاش و پێش خستووە و ریزیمکردوون، نەک بەپێی ئەو زنجیرە گوتارە بێ، کە کاتی خۆی، لە لاپەڕەی « **Kurdistanpost** »دا بڵاوکراونەتەوە.

بایەخێکی تایبەتییم، بەو گوتارانە داوە، کە لە سەر کێشەی « کەرکووک »، گرفتی هەڵبژاردن و پرۆسەی « ریفراندۆم » نووسیومن، لەبەرئەوە دەبینین، دوو گـوتار لە سـەر « کـەرکـووک »، دووبارەبوونەتەوە، کـاتی خـۆی، لە پەرتووکێکی دیکەدا بڵاومکردوونەتەوە. چونکە، پێوەندییەکی راستەوخۆیان، بە یەکـدییـەوە هەیە، بە پێـویسـتم زانی، جـارێکی دیکە بـڵاویانکەمـەوە، تا، زنجیرەی باسەکان نەپچڕێن. بەڵام، بە کورتیی نووسیومنەتەوە. هەروەها، هێندێ زانیـاریی نوێم، بۆ هێندێ لە گـوتارەکـان زیـادکردووە. جگە لەوەی، هێندێ هەڵەی رێنووس و چاپیان تێکەوتبوو، هەموویانم راستکردۆتەوە.

ئەم بەرهەمـە نوێیـە، لە « 21 » گوتاری جیاجیای نەتەوەیی و رامیـاریی پێکهاتووە. بە شێوەیەکی گشتیی، لە رەوشی ئێستەی رامیاریی « باشووری کوردسـتـان » دەدوێ، زۆر بە راشکاویی، قـامکم لە سـەر گرفتـەکـانی کورد داناوە و چارەسەری گونجاویشم، بۆ هێندێکیان پێشنیازکردووە.

هەرچەندە، ئەمانە بیروباوەڕی تایبەتیی خۆمن و ئەز وەک ناسیۆنالیستێکی دێمۆکراسیخوازی کورد، زۆر بە ڕاشکاویی، بیروباوەڕی خۆم دەربڕیوە، بەلام، لەگەڵ ئەوەشدا، هەموو کوردێکی نیشتمانپەروەر بۆی هەیە، باری سەرنجی خۆی دەربڕێ، ڕەخنە لە بیروباوەڕەکانم بگرێ، گەر لە هەر ڕوویەکەوە، هەڵەیەکم هەبێ، بۆم ڕاستکاتەوە و ڕێی ڕاستم پیشاندا، زۆرم پێ خۆش دەبێ و لە ناخی دڵەوە سوپاسیدەکەم!

خوێنەرانی هێژا!

ئەوا بەرهەمی « کورد و کێشەی کەرکووک »، لە بەر دەستتان دایە، هیوادارم، بە وردیی بیخوێننەوە و زۆر بە ڕاشکاویی، باری سەرنجی خۆتان، بەرانبەری دەربڕن، تا، بە هەموو لایەکمان بتوانین، لە لایەکەوە، بە شێوەیەکی باشتر و ڕاشکاوانەتر، بابەتەکان تاوتوێکەین و هەڵیانسەنگێنین. لە لایەکی دیکەشەوە، ڕازەی ووشەی پیرۆزی کوردیی، زمانی شیرینی دایک و ئەم نەتەوە بندەستە هەزارە بکەین. هەڵبەتە، مەبەستی هەموو لایەکیشمان، جگە لە دڵسۆزیی و ئەمەک نەبێ، هیچی دیکە نییە و سەرکەوتنیش، بۆ هەموو لایەک دەخوازم.

دوکتۆر حوسێن محەممەد عەزیز
ستۆکهۆلم

2005. 02. 01

# گوونی قۆڕ!

ڕۆژی « 17 .07 .2004 »، سەرۆک « یاسر عەرەفات »، بێ ئەوەی، بۆ لایەنە تایبەتیی و دەسەڵاتدارەکان بگەڕێتەوە، یا، پرس بە ئەنجوومەنی شالیارانی دەسەڵاتەکەی خۆی بکا، دەستی لە کاری نێوخۆی میریی « فەلەستین » وەردا، بە ناوی گۆڕانکاریی و گواستنەوەوە، سەرکردەی ئاسایشی گشتیی « عەبدولڕەزاق ئەلمجاهیدە »ی لابرد، « موسا عەرەفات »ی ئامۆزای لە جێی دانا و « حەربی عەرەفات »ی خزمیشی، بە بەڕێوەبەری ئاسایشی سنوور دامەزراند. هەروەها، نزیکەی پەنجا کارمەندی ئاسایشی دەرکرد و هێندێ گۆڕانکاریی دیکەشی کرد.

لەبەرئەوە، گێرمەوکێشەیەکی مەزن، لە نێو ڕیزەکانی گەل و میرییدا ڕوویدا. لە لایەکەوە، سەرۆک شالیاران « ئەحمەد قرەیع »، یەکسەر وازی لە پۆستەکەی خۆی هێنا. لە لایەکی دیکەشەوە، ئەندامانی ڕێکخراوی « کەتائیب ئەلشوهەداء ئەلئەقصا لیحەرەکەت ئەلفەتح »، دژی ئەو کارە ناڕەوایەی « عەرەفات » کردی، بێزاریی و نووڕەیی خۆیان دەربڕی. لە ئەنجامدا، هەراوئاژاوەیەکی گەورە، لە ڕیزەکانی گەلی « فەلەستین »دا پەیدابوو، دژی بڕیارەکانی « عەرەفات »، لە شارەکانی « غەزە » و « خانیونس » خۆپیشاندان دەستپێکرد. ئەوەبوو، بە تەواویی تەقییەوە، هێندێ چەکدار، پەلاماری کرتووخانەکانی بارەگەی سیخوڕیی سەربازییان دا، هێندێکیان لێ سووتاندن و گیراوەکانیان بەرەڵاکرد. پاشان، بارەگەی پارێزگە و شارەوانیی « خانیونس »یان داگیرکرد و داوایان لە « عەرەفات » کرد، « موسا » لابا و ئەو پەنجا کەسەی لە دەزگەی ئاسایش دووریخستبوونەوە، بۆ شوێنەکانی خۆیان بیانگێڕێتەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا، لە هێندێ نێوچە، بۆ پشتگیریکردنی « عەرەفات »، خۆپیشاندانێکی پێچەوانە سەریهەڵدا و خەریکبوو، کار لە کار بترازێ! تەنانەت، بارێکی وا خراپیان ئەفراند، هەراکەیان وا گەورەکرد، « خاڤیر سۆلانا »ی بەرپرسی پێوەندییە رامیارییەکانی دەرەوەی « یەکێتی ئەورووپا » هەڵیدایە، هەڕەشەی لە « عەرەفات » کرد و گوتی: گەر میرییەکەی « قرەیع » سەرکەوتوو نەبێ، « یەکێتی ئەورووپا » ناچاردەبێ، چاو بە بەرنامەکانی خۆیدا بگێڕێتەوە!
بۆیە، « ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی فلەستین »، لەگەڵ « عەرەفات »دا کۆبوونەوە، تا چارەسەرێکی پەلە، بۆ ئەو بارە ئاڵۆز و ناڵەبارە بدۆزنەوە و تووڕەبوونی جەماوەری گەل دامرکێننەوە. ئەم هەراوئاژاوە گەورەیە، نزیکەی دوو هەفتەی خایاند. بەڵام، لەوە دەچوو، لە بنەوە، لە سەر هێندێ خاڵ رێک کەوتبن، لە نێوە و دەرەوەی وڵاتیش، گوشارێکی زۆر، لە سەر « عەرەفات » هەبوو. لەبەرئەوە، وردەوردە، نارەزایی و تووڕەبوونەکەی گەل کپبوو!
هەرچەندە، « عەرەفات » چەن جارێ، دەسکێشانەوەکەی « قرەیع »ی، لە پۆستەکەی خۆی ڕەتکردەوە. بەڵام، لە کۆتاییدا، « ئەنجوومەنی یاسادانانی فلەستین » هەڵیدایە، داوایان لە « عەرەفات » کرد، وازهێنانەکەی « قرەیع » پەسەندکا، میرییەکی دیکە دامەزرێنێ و دەسەڵاتی پتریش، بە شالیاری نێوخۆ ببەخشێ، تا ئاسایشی نێوخۆ، بە شێوەیەکی باشتر بەڕێوەبچێ و بپارێزرێ!
هەڵبەتە، « عەرەفات » باش دەیزانی، ئەمە یەکەمین سەرۆک شالیاران نییە، وازدێنێ و لەگەڵیدا ناگونجێ، ئەمەش خۆی لە خۆیدا، بۆ ئایندەی رامیاریی ئەو باش نابێ. بۆیە، بە هەموو شێوەیە هەوڵیدەدا، « قرەیع » بمێنێتەوە و واز نەهێنێ! کەچیی، ئەو هەر لە سەر وازهێنانەکەی خۆی سووربوو، تا، ڕۆژی « 2004. 07. 27 »، بە تەوایی، کۆتایی بەو گرفتە گەورەیە هات و « قرەیع » خۆی، وازهێنانەکەی کێشایەوە، بە مەرجێ، دەسەڵاتی ئاسایشی نێوخۆی پتری هەبێ!
لە ڕاستییدا، « عەرەفات » ڕاژەیەکی زۆر گەورەی، کێشەی « فلەستین »ی کردووە، رامیار و دیپلۆماتێکی بلیمەتە، سەرکردەیەکی بە توانا و زیرەکە، بەڵەنسێکی باشی، لە نێوان باڵەکانی رزگارییخوازی « فلەستین »دا ڕاگرتووە، نیشتمانپەروەرێکی پاکە و گوڵی گەنجێتی خۆی، لە پێناوی کێشەی ڕەوای گەلەکەیدا هەڵوەراندووە. بەڵام، ئەمە هیچ لەو ڕاستییە ناگۆڕێ، گەر بڵێم: تا بڵێی، سەرکردەیەکی دیکتاتۆر و کەللەڕەقە، هێندێ

زیانیشی، بە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلەکەی گەیاندووە. بۆیە، ڕۆڵەکانی گەلی عەرەبی « فلەستین »، تووشی گونرەشی خۆیان بوون. بە کورتیی، وەک « کوونی قۆڕ » وایە، دەیبڕن، هەر وەی، نایبڕن، هەر وەی!!!
با بزانین، ئەم ڕووداوە گرنگە، چی دەگەیەنێ؟ زۆربەی چاودێرانی ڕامیاریی لەو باوەڕەدابوون، ئیدی چی دیکە ناتوانرێ، دەسەڵاتی ڕەها و بێ ئەندازەی « عەرەفات » قەبوولکرێ، لە هەموو شتێکدا، تەنیا هەر ئەو بڕیاربدا و قسەکانی ڕەت نەکرێنەوە. جگە لەوەی، ئەم ڕووداوەیان، بە سەرەتای تێکچوونی یەکێتی ڕیزەکانی گەلی « فلەستین » دادەنا، گوایە: یەکێتی نێوان ڕێکخراوە ڕامیارییەکان لێک هەڵدەوەشێن و لەوانەیە، سەرەتای جەنگێکی نێوخۆیی، نێوان باڵەکانی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی « فلەستین » بێ. ئەمەش خۆی لە خۆیدا، ئاواتێکی مەزن و دێرینی سەرانی « ئیسرایل » بوو، تا، ڕۆڵەکانی گەلی « فلەستین »، لە نێوخۆدا یەکدی سەربڕن!
بەڵام، لە ئەنجامی گوشارێکی زۆری، نێوخۆی ڕۆڵەکانی گەلی « فلەستین »، سەرانی دەوڵەتە عەرەبییەکان و « یەکێتی ئەورووپا »دا، ئەو پێشبینیی و بۆچوونانە، ڕاست دەر نەچوون. بەڵکوو، هەموو لایەکیان، وازیان لە هێندێ داواکاریی خۆیان هێنا، بە چارەسەرێکی مامناوەندیی قایلبوون، تا ڕیزەکانی بزووتنەوەی گەلی عەرەبی « فلەستین »، لەوە کز و لاوازتر نەبێ و دوژمنەکانیشیان کەڵکی لێ وەر نەگرن!
کەچیی، گەر سەرنجێ، لە باری دەسەڵاتی ئەو دوو میرنشینەی « هەولێر » و « سولەیمانیی » بدەین، زۆر بە ڕوونیی دەبینین: « بارزانیی » و « تاڵەبانیی »، بێ ئەوەی، هیچ جۆرە خەسڵەتێکی فەرمییان، لە مێژییدا هەبێ، چییان بوێ، بە ئارەزووی دڵی خۆیان دەیکەن، شالیار و سەرۆک شالیاران دادەمەزرێنن، دەریاندەپەڕێنن، یەکێکی دیکەیان لە جێ دادەنێن و پرسیش بە کەس ناکەن! تەنانەت، « بارزانیی » لەگەڵ سکرتێری پارتەکەی خۆیدا « جەوهەر نامیق سالم » تێکچوو، بە شێوەیەکی ناشیرین وەلامدرایەوە، تا وای لێ کرد، واز لە پۆستەکەی خۆی بێنێ، لە ماڵی خۆی دانیشێ و سکرتێرێکی نوێ دابنێ!
ئەم هەڵسوکەوت و دیاردانە ئەوە دەگەیەنن.
1. ئەو دوو بەرپرسە گەورەیەی « پارتیی » و « یەکێتیی »، ڕێز لە ویست و ئارەزووەکانی گەلی کورد لە « باشووری کوردستان »دا ناگرن.
2. هەرچەندە، خۆیان دەسەلاتەکەیان ناوناوە « میریی هەرێم ـ بەڕێوەبەرێتی هەولێر و سولەیمانیی »، بەڵام، لە ڕاستییدا، هیچ جۆرە خەسڵەتێکی میریی هاوچەرخیان تێدا نییە. بەڵکوو، پتر لە دوو میرنشین دەچن! بۆیە خۆشیان،

وەک دوو سەرکردەی خێڵەکیی دوو میرنشین، هەڵسوکەت لەگەڵ دەسەڵاتەکەی خۆیاندا دەکەن.
3. خۆیان لەو دوو میرنشینە، گەلێ بە گەورەتر دەزانن. ئەگینا، گەر وا نییە، هەڵبەتە، یەکێکیان بەرپرسیی، لە دەسەڵاتەکەی خۆیدا وەردەگرت!
4. ڕۆڵەکانی گەلی کورد بە گشتیی، ڕێکخراو و پارتە ڕامیارییەکانی دیکەی « باشووری کوردستان » بە تایبەتیی، هیچ جۆرە دەسەڵاتێکیان نییە. لەبەرئەوە، لە هەموو جۆرە کارێکی هەڵە و خراپەکارییەک، خۆیان کەنار گرتووە، زیندوو نین، گیانی بەربەرەکانێییان تێدا ناسێنراوە، هەست بە لێپرسینەوە ناکەن، ئەرکەکانی سەر شانیان بەجێ ناهێنن و ئەو دوو دەسەڵاتە، بە هی خۆیان نازانن. چونکە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ، بەشداریی تێدا ناکەن!
بە داخێکی گەورە و گرانەوە، ئەو دوو سەرکردەیە دەیانتوانی، ڕۆڵەکانی گەل، پەرلەمان، دەزگەکانی میریی هەرێم، ڕێکخراو و پارتە ڕامیارییەکانی دیکەی « کوردستان »، لە زۆر بڕیاری نەتەوەیی و ڕامیاریی گرنگدا بەشداربکەن. بەڵام، ئەوان نایانەوێ، گوێ لە دەنگی داواکاریی و پێشنیازەکانی گەل بگرن، مەگەر، بۆ بەرژەوەندیی تایبەتیی خۆیان بێ!
بۆیە، ئەو دوو سەرکردەیە دەتوانن، هەموو بڕیارێکی چەوت، بە سەر گەلی کورددا بسەپێنن، هەموو کردەوەیەکی خراپ، بە سەر کورددا تێپەڕێنن! هیچ کەس و لایەنێکیش نییە و ناتوانێ، بە ڕاشکاویی بەرەنگاریانبێتەوە، خۆپیشاندان سازکا، بڕیارەکانیان ڕەتکاتەوە و پێیان بڵێ: ئەرێ ئێوەی سەرکردە، پتر لە چل ساڵ دەبێ، بە ناوی شۆڕش و گەلی کوردەوە، ئاژاوەیەکی گەورەتان، لە « باشوور »دا هەڵگیرساندووە، بە هەزاران ڕۆڵەی کورد، لە پێناوی سەربەستیی کورد و سەربەخۆیی « کوردستان »دا، گیانیان لەدەستداوە، بە هەزاران گوند، لەگەڵ زەویدا زێروژوورکراوە، نابێ، کەمێ ڕێز لە داواکاریی و ئامانجەکانی گەلەکەمان بە گشتیی و خوێنی شەهیدان بە تایبەتیی بگرن؟! ئایا، بەم خەسڵەتە دزێو و شێوازە پڕ لە هەڵەیەوە دەتانەوێ، « کوردستان » بەرەو کوێ بەرن؟! تا کەی، تەنیا هەر بە دەم، بانگەشەی دیمۆکراسیی و ئازادیی دەکەن، بە کردەوەش دژ دەوەستن؟! ئایا، کاتی ئەوە نەهاتووە، ئاوڕێ لەو گەلە هەژارە دڵسۆزە بدەنەوە، شەقێ لە بەرژەوەندیی تەسکی بنەماڵە و پارتایەتیی هەڵدەن، تەنیاوتەنیا، هەر بۆ کورد هەوڵبدەن؟!!

* * *

# کێشەی دەسەڵات

هەموو پارتە چەپ و کۆمۆنیستەکان، هەموو پارتە دیکتاتۆرییی و سەر بە بنەماڵەکان، مەگەر سەرۆک و سکرتێرەکانیان مردبن، یا، بە ئارەزووی خۆیان وازیانهێنابێ، ئەگینا، تا مردن، دەسیان لە قووڵفی « کەعبە ی دەسەڵات بەر نەداوە و نەگۆڕراون!
بە پێچەوانەشەوە، هەموو پارتەکانی دەوڵەتە دیمۆکراسییەکانی، وڵاتانی هەر سێ کیشوەرە گەورەکەی « ئەورووپا، ئەمێریکا و ئوسترالیا »، هەر چەن ساڵ جارێ، کۆنگرە دەگرن، گەر سەرکردەکانیان، لە هەڵبژاردندا دەر نەچوون، ئیدی، مافی ئەوەیان نییە، پۆستی سەرۆک، یا، سکرتێری پارت داگیر و پاوەنکەن! یا گەر، کارێکی خراپیان لە دەس قەوما، شتێکی ناشیرینیان کرد، بە زیانی پارت و دەوڵەتەکانیان تەواوبوو، ئەوا، پێویستی بەوە نییە، چاوەڕێی کۆنگرە بکەن، ئینجا لایانبەرن. بەڵکوو، هەر یەکسەر، ڕەخنەی توندیان لێ دەگرن و لە دەسەڵات دووریاندەخەنەوە!
بەڵام، گەر تەماشایەکی نەخشەی دابەشبوونی، پۆستی سەرۆک و سکرتێری گشتیی پارتەکانی « کوردستان » بکەین، بە تەواویی، بە پێچەوانەی هەموو پارتەکانی گەلانی جیهانەوە دەیبینین!
بۆ نموونە: ماوەی پەنجاوهەشت ساڵ دەبێ، « پارتی دیمۆکراتی کوردستان » دامەزراوە. تا ئێستە، دوازدە کۆنگرەی گرتووە. بەڵام « پارتیی »، تەنیا هەر دوو سەرۆکی هەبووە. « بارزانیی » باوک، ماوەی سیوسێ ساڵ سەرۆک بوو، گەر کۆچیدوایی نەکردایە، تا ئێستەش، هەر سەرۆک دەبوو! دوای ئەویش، ئەوا، ماوەی بیستوپێنج ساڵە، « مەسعوود بارزانیی » کوڕی، سەرۆکە و تا لە ژیانیشدا بێ، هەر دەبێ، سەرۆک بێ! چونکە، « پارتیی »، پارتی بنەماڵەی هۆزی گەورەی « بارزانیی »یە و لە سیستێمی بنەماڵەشدا، دەسەڵاتی ڕامیاریی، وەک هەموو شتەکانی دیکە، لە باوکەوە بۆ کوڕ، یا، لە برای گەورەوە بۆ برای پچووک دەگوێزرێتەوە!

بیستونۆ ساڵە، « یەکێتی نیشتمانیی کوردستان » دامەزراوە. تەنیا دوو کۆنگرەی گرتووە. بەڵام، تەنیا هەر « جەلال تاڵەبانیی »، پۆستی سکرتێری گشتیی هەیە. جا، ئەگەر خۆی وازبێنێ، یا کۆچیدواییبکا، ئەگینا، وەک بۆی برابێتەوە، تا ماوە، هەر دەبێ، سکرتێری گشتیی « یەکێتیی » بێ! ئەگەر هەر خواش بۆ خۆی بزانێ، « بارزانیی » و « تاڵەبانیی »، چەن ساڵی دیکە دەژین، سەرۆک و سکرتێری، ئەو دوو زلپارتەی « کوردستان » دەبن؟!!
کورد گوتوویەتی: « گەورە ناو دەرێژێ، بچووک پێی لێدەخا! » لەبەرئەوە، شتێکی سەیر نییە، گەر پارتە بچووکەکانیش، بە چاولێکەری لە پارتە گەورەکانی بنەماڵەی « بارزانیی » و « جەلال تاڵەبانیی »، پۆستی سکرتێری پارتەکانیان، لە سەر خۆیان تاپۆکردبێ و بە هیچ شێوەیە، دەسبەرداری نەبن! بۆ نموونە:
« حیزبی زەحمەتکێشانی کوردستان، بزووتنەوەی دیمۆکراسیخوازانی کوردستان، حیزبی سۆسیالستی دیمۆکراتی کوردستان »، ئەوەتەی دامەزراون، « قادر عەزیز، بەهادین نووریی و حەمەی حاجی مەحموود »، پۆستی سکرتێری پارتەکانیان وەرگرتووە! هەڵبەتە، ئەو جۆرە پارتە بچووکانە، هیچ ئایندەیەکی ڕامیاریی گەشیان نییە، هەر هێندە بڕەکەن، تا سکرتێرەکانیان لە ژیاندا بن، پاش خۆیان، کەسێکی وا نییە، جێیانبگرێتەوە و هەر زووش هەڵدەوەشێنرێنەوە!
هەروەها، گەر سەرنجێکی سەرپێیی، لە ڕەوشی پارتەکانی دیکەی پارچەکانی « کوردستان »یش بدەین، جیاوازییەکی ئەوتۆیان، لەگەڵ پارتەکانی « باشوور »دا نییە. هەر بۆ نموونە: پتر لە بیستوپێنج ساڵ دەبێ، « P.K.K. » دامەزراوە و پتر لە شەش کۆنگرەشیان گرتووە. کەچیی، تەنیا هەر « عەبدوڵڵا ئۆجەلان » سکرتێری گشتیی بووە. تەنانەت، هێندێ جاریش، لە کۆنگرەدا ئامادە نەبووە و بە تێلێفۆن بەشداریکردووە! دوای ئەوەی فڕێنرا و دەسگیریشکرا، وا پتر لە شەش ساڵ دەبێ، لە قوژبنی گرتووخانەی « ئیمراڵیی »دا توندکراوە، کەچیی، هەر سکرتێری گشتیی پارتەکەیەتی و تا لە ژیانیشدا بێ، هەر ئەو سکرتێر دەبێ!
بەڵام، گەر بەراوردێ، لە نێوان پارتەکانی هەر سێ پارچەی « کوردستان » و پارتەکانی « ڕۆژهەڵات »دا بکەین، ئەوا دەبینین: ئەم بارە، لە « ڕۆژهەڵات »، کەمێ جیاوازیی هەبووە و جیاوازیشی هەیە. چونکە، لەو ڕۆژەوە، « حیزبی دیمۆکراتی کوردستانی ئێران » درووستبووە، تا ئەورۆ، سیازدە کۆنگرەیان گرتووە، چەن سەرۆک و سکرتێریان هەبووبێ، تا هەموویان، بە دەسی

داگیرکەری دەوڵەتی « ئێران »، شەهید نەکرابن، پۆستەکەی خۆیان پاراستووە. بەڵام، لە دوای خۆیان، یەکێ لە ئەندامانی بنەماڵەکانیان نەبووە، تا جێیان بگرێتەوە! لەگەڵ ئەوەشدا، لە دوا کۆنگرەیاندا، سکرتێری پێشووی پارت « عەبدوڵڵای حەسەنزادە » لابرا و « مستەفا هیجری » هەڵبژێردرا، هەرچەندە، ئەمە یەکەمین جار نییە، ئەو سکرتێر بێ!

# 2 ووڵات و 4 پارت!

له « ووڵاته یەکگرتووەکانی ئەمیریکا »، چەندین ساڵ دەبێ، جگە لەوەی، چەندین پارتی گچکە دامەزراون، دوو پارتی گەورە و سەرەکیی دیکەی وەک: « دیمۆکراسیی » و « کۆماریی »ش درووستبوون. بەڵام، هیچ جۆرە گرفتێکی رامیاریی و سەربازیی، له نێوانیاندا ڕووی نەداوە! چونکە، « دیمۆکراسیی » ڕاستەقینە هەیە و هەر چوار ساڵ جارێ، هەڵبژاردن دەکرێ. هەرچەندە، هەموو جارێ، تەنیا هەر، ئەو دوو پارتە، له هەڵبژاردنەکاندا دەردەچن، تەنیا هەر، ئەو دوو پارتە مەزنە دەتوانن، ڕۆڵی سەرەکیی، له زۆربەی زۆری، بوارەکانی ژیانی « نەتەوەیی، ڕامیاریی، دیپلۆماسیی، سەربازیی، ئابووریی، کەلتووریی ... » گەلی « ئەمیریکا »دا ببینن، بەڵام، پارتە پچووکەکانیش، هەموو مافێکی یاسایی خۆیان پارێزراوە و ڕێزی تایبەتیی خۆیان هەیە!

هەروەها، له « باشووری کوردستان »یش، جگە له چەندین کۆمەڵ، پارتی ئایینیی و « سیکولار »ی گچکە، دوو پارتی گەورەی دەسەڵاتداری وەک: « پارتی دیمۆکراتی کوردستان » و « یەکێتی نیشتمانیی کوردستان »یش هەن. کەچیی، بە پێچەوانەی ئەو دوو پارتەی له « ئەمیریکا » هەن، هەموو وێنەکان، لەو بەشەی « کوردستان »دا پێچەوانەبوونەتەوە! چۆن؟

ئەوەتەی ئەو دوو پارتە درووستبوون، گرفتی ڕامیاریی و سەربازیی، بە شێوەیەکی بەردەوام، له نێوانیاندا هەبووە و هەیە. چونکە، « دیمۆکراسیی » ڕاستەقینە نەبووە و هەر بە ناویش هەیە. ئەوا، پتر له دوازدە ساڵیش دەبێ، تەنیا هەر یەک جار، هەڵبژاردن بۆ « پەرلەمان » کراوە. پارتە پچووکەکان، گەر له خولگەی بەرژەوەندیی و بۆچوونەکانی ئەواندا نەخولێنەوە، ئەوا، هیچ جۆرە مافێکی یاسایی و ڕێزێکی تایبەتییان نییە. چونکە، جگە لەوەی، ئەوان بەخێویاندەکەن، ئەو دوو پارتە گەورەیەش، ڕۆڵێکی مەزن، له هەموو بوارەکانی ژیانی کۆمەڵگەی کوردەوارییدا وازیدەکەن!

لە « ئەمێریکا »، چەن پرینسیپ و یاسایەک هەیە، هیچ یەکێ لەو دوو پارتە ناتوانن، لێی لادەن و هەرزەکارانە هەڵسوکەوتیکەن. لە سەرووی هەموو شتێکیشەوە، دەستوورێکی نووسراو و نەگۆڕ هەیە، پێویستە، هەموو لە سەری بڕۆن و پێڕەویکەن. هەروەها، جگە لەوەی « کۆنگرێس » و ئەنجوومەنی « پیران »یش، دەسەڵاتی تایبەتیی خۆیان هەیە، دەزگەکانی دادگەی باڵای دەوڵەتیش، ڕۆڵێکی باڵا، لە چاودێرییکردن و لێپێچینەوەی لێپرسراواندا دەبینن. لەبەرئەوە، کارەکان وەک پێویست بەڕێوەدەچن، هیچ کەسێ بۆی نییە، خۆی لە یاسا بە گەورەتر بزانێ، هەموو هاوڵاتییەک، هەر لە مرۆیەکی ئاساییەوە بیگرە، تا بە سەرۆک کۆمار دەگا، لە بەردەم یاسادا، چوونیەکن و هیچ جیاوازییەکیان نییە. گەر هەر گرفتێکیش ڕوویدا، ئەوا، بە شێوازێکی « دیمۆکراسیی »یانە و دادپەروەرانە، چارەسەردەکرێ.

کەچیی، لە « باشووری کوردستان »، تا ئێستە، چەن پرینسیپ و یاسایەکی « کوردستانیی » نییە، بەڵکوو، زۆربەی زۆری ئەو شتانەی هەن، لە یاسای « عێراق »ەوە وەرگیراون. هەر دوو پارتی دەسەڵاتدار، بە هیچ شێوەیە، بە هیچ یاسایەکەوە پابەند نین. دەستوورێکی نووسراو نییە، تا لە سەری بڕۆن و پێڕەویکەن. هەرچەندە، دەزگەی « پەرلەمان » هەیە، بەڵام، هەر بە ناو هەیە و خۆشیان ڕێزی لێ ناگرن! لەبەرئەوە، هیچ جۆرە دەسەڵاتێکی نییە، ئەو بڕیارانەی دەیدا، تەنیا هەر قسەی ڕووت نەبێ، هیچی دیکە نییە. دادگەی باڵای هەرێم، توانای ئەوەی نییە، چاودێریی کردارە خراپەکانی ئەو دوو پارتە بکا و لێپێچینەوەیان لەگەڵ بکا! بۆیە، کارەکان زۆر بە خراپیی، بەڕێوەدەچن، هاوڵاتییان، لە بەردەم یاسادا، چوونیەک نین و جیاوازییان هەیە، بە تایبەتیی، ئەو دوو سەرکردەیە « بارزانیی » و « تاڵەبانیی »، لەگەڵ هێندێ لە ئەندامانی سەرکردایەتی هەر دوو پارتدا، نەک هەر لە سەرووی یاساوەن، بەڵکوو، لە گەلی کوردیش گەورەترن! لەبەرئەوە، هەر گرفتێ ڕوویدا، شەقێ لە « دیالۆگ » و « دیمۆکراسیی » هەڵدەدەن، پەنا بۆ بەر زمانی بازاڕ و چەک دەبەن، تا گرفتەکانی نێوانیان، چارەسەرکەن!

ڕاستە، هەر دوو پارتی « کۆماریی » و « دیمۆکراسیی »، دوو پارتی سەربەخۆن، بەڵام، لە بەردەم بەرژەوەندیی باڵای « ئەمێریکا »دا، وەک یەک گیان وان و لە دوو جەستەی جیاواز دان! یەک ستراتیژی درێژخایەنی نەتەوەییان هەیە، یەک دید و بۆچوونی تایبەتییان هەیە!

لە ڕاستییدا، ئەو دوو پارتە گەورەیە، لە زۆر شتدا، جیاوازییەکی ئەوتۆیان نییە، بە تایبەتیی، لە ڕامیاریی دەرەوەدا، هەر دووکیان هەمیشە، بەرژەوەندیی

دەوڵەت و گەلی « ئەمریکا »یان، پێش هەموو جۆرە بەرژەوەندییەکی دیکەوە خستووە. چونکە، چ « دیمۆکراسی »یەکان و چ « کۆماری »یەکان، پێش ئەوەی، خۆیان بە ئەندامی ئەو دوو پارتە بزانن، خۆیان بە « ئەمریکایی » دەزانن. واتە: بەرژەوەندیی باڵای گەل و نیشتمان، لە سەروو بەرژەوەندیی پارتایەتیی تەسکەوە دادەنێن. ئەوەش خۆی لە خۆیدا، بۆ خاکوخۆڵی نیشتمان، بۆ کوڕوکاڵانی گەل، بە ئەو پەڕی نیشتمانپەروەریی و دڵسۆزیی دادەنرێ. لەبەرئەوە، هەر کاتێ، هەر جۆرە مەترسییەک، ڕوو لە وڵاتەکەیان بکا، هەموو وەک پەنجەکانی دەس، بە یەک ڕیز و پێکەوە، دژی دەوەستن و داکۆکیی لە نیشتمانەکەی خۆیان دەکەن!

کەچیی، ئەو دوو پارتەی « کوردستان »، لە زۆر شتدا، جیاوازییان هەیە، چونکە، هەمیشە دید و بۆچوونیان، بۆ گرفت و چارەسەرکردنی کێشەکانی کورد جیاوازە. لەبەرئەوە، ئەندامانی « پارتیی » و « یەکێتیی »، پێش ئەوەی، خۆیان بە کورد دانێن، خۆیان بە ئەندامانی ئەو دوو پارتە دادەنێن! واتە: بەرژەوەندیی تەسکی پارتایەتیی، پێش بەرژەوەندیی بڵندی گەل و نیشتمانەوە دەخەن! لەبەرئەوە، سەرانی ئەو دوو پارتە، هەمیشە هەوڵدەدەن، هاوکاریی لەگەڵ داگیرکەری نیشتمانەکەیاندا بکەن، بۆ ئـــــەوەی، دژی لاکەی دیکە، « دوژمنێکی دۆست »پەیداکەن، پشتی هاوخوێن و هاوزمانەکانی خۆیان، لە زەوی بدەن، هەر وەک چۆن، چەن جارێ، لە چەن سەردەمێکی جیاوازدا و بە نۆرە، ئەو کاریان کردووە و لەشکری دەوڵەتە داگیرکەرەکانی « توورکیا، ئێران و عێراق »یان، بۆ سەر یەکدی هێناوە!

ئەو دوو پارتەی « ئەمریکا »، بە یەک دەنگ و ڕەنگ، بەرانبەر مەترسیی تیرۆریزم دەوەستن، بە یەک دڵ و گیان، بیر لە چارەسەرکردنی گرفتەکانیان دەکەنەوە، بە یەک دەس، دژایەتی تیرۆر و تیرۆریستان دەکەن و بەرانبەریان دەجەنگن. کەچیی، لە کاتێکدا، ڕۆژبەڕۆژ، مەترسیی تیرۆری بزووتنەوەی ئیسلامی ڕامیاریی، لە « باشووری کوردستان » زیادی دەکرد، بنکەی بیانیی لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتیاندا دادەمەزرا و کەرای شانەی نهێنیی تیرۆریان دەخست، ئەو دوو پارتە، چ بە نهێنیێ و چ بە ئاشکرا، دژی یەکدی، یارمەتییاندەدان و هاوکارییاندەکردن، تا، هەر دوو لایان، بە ئاگری کردەوە چەوتەکانی خۆیان سوتان و چەندین جار، دەسیان لێ وەشاندن!

لە « ئەمریکا »، ئەوانەی خۆیان، بە ئەندامی پارتی « دیمۆکراسی » دەزانن، لە ژێر ئاڵای ئەو پارتەدا کۆبوونەتەوە و خەباتدەکەن، وەنەبێ، باوەڕیان بە سیستێمی « کۆماریی » نەبێ! یا، ئەوانەی خۆیان، بە ئەندامی « کۆماریی »

دەزانن، لە ڕیزی ئەو پارتــــەدا تێدەکۆشن، وەنەبێ، باوەڕیان بە سیستێمی « دێمۆکراسیی » نەبێ! نەخێر، ئەمە هەرگیز وا نییە، گەر هێندێ کەس، وا تێبگەن، ئەو دوو پارتە، لە لێکدانەوەی ئەو دوو چەمکەدا، جیاوازییان هەیە، بە هەڵەدا چوون. بەڵکوو، ئەندامانی هەر دوو پارتەکە، باوەڕێکی تەواویان، بە هەر دوو چەمکی « دێمۆکراسیی » و « کۆماریی » هەیە. چونکە، جگە لەوەی، لای ئەوان، ئەو دوو چەمکە، بۆ بەختەوەریی و سەرفرازیی گەل بەکاردێنرێ، لە هەمان کاتیشدا، لە یەکدی جیا ناکرێنەوە. بەڵکوو، دەسەڵاتی سیستێمی دووەمیــان، هەر لە کـانیاوی ڕوون و سـازگاری سیـستێمی یەکەمەوە هەڵدەقوڵێ! بەلام، لە کاری باشدا، ڕکەبەرایەتی یەکدی دەکەن. بۆیە، هەر چوار ساڵ جارێ، هەڵبژاردن دەکرێ، بە شێوەیەکی « دێمۆکراسیی »، بێ گزیی و دزیی کردن، هەر جارەی، یەکێکیان دەسەلات وەردەگرێ.
کەچیی، هەموو ئەوانەی، لە ڕیزەکانی « پارتیی »دا کاردەکەن، باوەڕێکی تەواویان، بە سەرکردایەتی پارت و سەرانی بنەماڵەی « بارزانیی » هەیە، وەنەبێ، باوەڕیان بە « یەکێتیی » ڕێزەکانی گەل هەبێ! بە هەمان شێوەش، هەموو ئەوانەی، لە ژێر ئاڵای سەرکردایەتی « یەکێتیی »شدا کۆبوونەتەوە و بە ڕێبەرێتیی « جەلال تاڵەبانیی » قایلبوون، وەنەبێ، باوەڕێکی تەواویان، بە دروشمی « دێمۆکراسیی » هەبێ. واتە: ئەمە، گەر شتێ بگەیەنێ، تەنیا هەر ئەوەیە: نە هیـچیان، هێندە « نیشتمانپەروەر »ن، نە هیـچیشیـان، هێندە باوەڕیان، بە سیستێمی « دێمۆکراسیی » و دروشمی « یەکێتیی » ڕیزەکانی گەل هەیە!
لە « ئەمـێـریکا »، گـەر هەر ئەندامـێکی ئاسـایی، یا، هەر ئەندامـێکی سەرکردایەتی ئەو دوو پارتە، کارێکی نارەوا بکا، لەگەڵ یاسا و دەستووری پارت و دەوڵەتدا نەگـونجێ، یا دزیـبـکا، یا ناپاکـیی لە پارت، گـەل و نیشتمانەکەی خۆی بکا، ئەوا، بێ ئەوەی، یەک و دووی لێبکرێ، یەکسەر، لێپێچینەوەی لەگەڵ دەکرێ و بە سزای ڕەوای خۆی دەگەیەنرێ.
کەچیی، لە « کوردستـان »، ئەندامـانی هەر دوو پارتی گـەورە بە تایبـەتیی و ئەندامـانی سـەرکـردایەتی بە گـشـتـیی، تەنانەت، هێندێ جـاریش، خـزم و کـەسـەکـانیـشـیـان، لەبری لێـپـێـچـینەوەیان لەگـەڵ بکرێ و سـزابدرێن، چاوپۆشییان لێ دەکرێ و هێندێ جاریش، خەڵاتدەکرێن!
ئەو دوو پارتەی « ئەمێریکا »، بە ڕاستـیی، بە دوو پارتی « ئەمێریکایی » و گــەلی « ئەمــێــریکا » دادەنرێن، لە چوارچێـــوەی سنووری « وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمێریکا »دا کاردەکەن و « ئەمێریکایی »یانەش بیردەکەنەوە!

کەچیی، هەر دوو پارتە زلهێزەکەی « باشووری »ی مەزن، هەرچەندە، ناوی پیرۆزی « کوردستان »یان، بە دوای پارتەکانیانەوە نووساندووە و شانازییشی پێوە دەکەن، بەڵام، لە ڕاستییدا، دوو پارتی « کوردستانیی » ڕاستەقینە نین. چونکە، لە لایەکەوە، کوردانە و « کوردستانیی »یانە بیر ناکەنەوە، بەڵکوو، « عێراقیی »یانە بیردەکەنەوە. لە لایەکی دیکەشەوە، بەرژەوەندیی تەسکی تایبەتیی « تاکەکەسیی، بنەماڵە و پارتایەتیی »، پێش هەموو جۆرە، بەرژەوەندییەکی باڵای « هەرێمایەتیی » و « نەتەوایەتیی »یەوە دەخەن!
ئەو دوو پارتەی « ئەمێریکا »، نەک هەر یەکپارچەیی خاک و دەوڵەتەکەیان پاراستووە و دەشیپارێزن، بەڵکوو، وازیشیان لە یەک بست، لە خاکی نیشتمانەکەی خۆیان نەهێناوە و وازیشی لێ ناهێنن! لەبەرئەوە، یەک وڵات، یەک دەوڵەت، یەک میریی، یەک جۆر یاسا و یەک دەسەڵاتیشیان هەیە!
کەچیی، ئەو دوو پارتەی لای ئێمە، لەبری ئەوەی، یەکپارچەیی خاک و یەکێتیی میریی هەرێم بپارێزن، پارێزگاریی لە یەکپارچەیی خاک و دەوڵەتە داگیرکەرەکەی « عێراق » دەکەن! ئەو بەشەی « کوردستان »یشیان، دوولەت کردووە، دوو میرنشینیی بچووکیان تێدا دامەزراندووە. لە یەک کاتیشدا، هەر دوو پارتەکە، دەسەڵاتیان هەیە و فەرمانڕەواییدەکەن، دوو جۆرە یاسا، بۆ خەڵکی کوردی بندەسیان دەردەکەن! جگە لەوەی، وازیان لە هێندێ نێوچەی « کوردستان » هێناوە، گەر لە ترسی یەکدی و ڕۆڵەکانی گەلیش نەبووایە، ئەوا، هێندێ نێوچەی خاکی « کوردستان »یشیان، بە بیانیی دەفرۆشت!
بە کورتیی: ئەوان وڵاتیان هەیە، ئێمەش هەمانە. ئەوان دەوڵەتی سەربەخۆیان هەیە، ئێمەش هەرێمێکی سەربەخۆمان هەیە. ئەوان دوو پارتی گەورەیان هەیە، ئێمەش هەمانە. **بەڵام**، ئەوەی ئەوان هەیانە و ئێمە نیمانە، پتر خۆی لە « دیمۆکراسیی، ئازادیی، یاسا، دەستوور، یەکێتیی، تەبایی، هەستی نیشتمانپەروەریی، دڵسۆزیی، چەن پارتێکی باش و سەرکردەیەکی بلیمەت »دا دەبینێ! ئاخر، دوای چەن هەزار ساڵ ژێردەسیی و چەوساندنەوە، بۆ دەبێ، وابێ؟ ئایا، ئەوان و ئێمەش، هەر مرۆ نین و لە یەک قوڕ دروست نەکراوین؟!! ئاخۆ، چەن ساڵی دیکەمان بوێ، تا بە ئەوان بگەین؟!!

* * *

# 1 هەرێم و 2 میرنشین!

سەرکردە دڵسۆز و نەبەزەکانی گەلانی بندەس و چەوساوەی جیهان، هەوڵێکی زۆریان داوە، خەباتێکی زۆری بێ وچانیان کردووە، خوێنێکی زۆریان ڕشتووە، تا نیشتمانەکانیان، لە ژێردەستی دەوڵەتە داگیرکەرەکانیان، بە تەواوی ڕزگارکردووە، ئالای نەتەوەیی خۆیان، لە سەر بەرزترین باڵەخانە و لووتکەی چیا سەرکەشەکانیان هەڵکردووە، تا، لە ئاسمانی سەربەخۆیی و سەربەستیی نیشتمانەکانیاندا بشەکێتەوە!

هەموو ئەو نەتەوە دابەشکراو و لەتوپەتکراوانەی، خاکی نیشتمانەکانیان، لە بندەستیی و چەوساندنەوە ڕزگاریانبووبوو، بەڵام، یەککگرتوو نەبوون و چەن لەت کرابوون، سەرکردەکانیان، هەموو توانای خۆیان بەگەڕخست، تا، خاکە دابەشکراوەکانیان یەکبگرنەوە و سنوور لە نێوان ڕۆڵەی، ئەو گەلە لە یەکدی بچڕاوانەدا نەمێنێ!

خۆ بە گاڵتە نەبوو، سەرکردەکانی گەلانی « ڤێتنام، ئەڵمانیا، یەمەن ... »، خۆیان ماندوودەکرد، هەموو جۆرە هەوڵێکی دڵسۆزانەی « ڕامیاریی، دیپلۆماسیی و سەربازیی »یان دەدا، تا، هەر دوو دەوڵەتەکانیان یەکبگرنەوە. ئەوە بوو، لە ئەنجامی ئەو خەباتە درێژ و بێ وچانەیاندا، هەر دوو دەوڵەتی « ڤێتنامی خۆرهەلات و خۆراوا، یەمەنی باکوور و باشوور، ئەڵمانیای ڕۆژهەلات و ڕۆژاوا »، هەر دەوڵەتەی، لە چەن سەردەمێکی جیاواز و بە چەن شێوازێکی جیاجیا، یەکیانگرتەوە، ڕۆڵەکانیان، بە یەکدی شادبوونەوە، چی دیکە، هەژدیهای دوو سەری سنوور، لە نێوان ڕۆڵەی ئەو گەلانەدا نەما، بێ پرس و ترس، لەم بەری وولاتەوە، بۆ ئەو بەری وولات، بە ئارەزووی خۆیان دەگەڕێن و گەشتی پێدا دەکەن!

کەچیی، جگە لەوەی، هێزەکانی ئیمپریالیزمی جیهانخۆر و دەوڵەتە داگیرکەرەکانی « کوردستان »، خاکی نیشتمانەکەمانیان داگیر و دابەش کردووە، ڕۆڵەکانی نەتەوەی کوردیان، وەک گوێزەبانەی « جێژنی لەدایکبوون » بە سەر هەر چوار دەوڵەتە داگیرکەرەکانی « تورکیا، ئێران، عێراق و سووریا »دا بەخشیوەتەوە، هەژدیهای چوارسەری سنوور، ڕۆڵەکانی کورد هەڵدەلووشێ، سەرانی کوردیش، نەک هەر نەیانتوانیوە، پارچەیە لە خاکی نیشتمانەکەمان ڕزگارکەن و دەوڵەتێکی نەتەوەیی تێدا دامەزرێنن، بەڵکوو، هێندەی دیکەش، قوورەکەیان بۆ کورد خەستترکردۆتەوە و هەژدیهایەکی دوو سەری دیکەی سنووریشیان، لە نێوان هەر دوو دەسەڵاتەکەی خۆیاندا قووت کردۆتەوە! چونکە، هەر دوو سەرکردایەتی « پارتیی » و « یەکێتیی »، خاکی « باشووری کوردستان »یان، بە سەر دوو نێوچەی دەسەڵات و دوو میرنشینی خێڵەکییدا دابەشکردووە.
بەڵێ، ئەو دوو سەرکردە دڵسۆزە « بارزانیی » و « تاڵەبانیی »، لە پێناوی پارە و دەسەڵاتی ڕامیاریی خۆیان و پارتەکانیاندا، هەر لەساڵی « 1996 »ەوە، خاکەکەیان دوولەتکردووە، هەر پارتەی بە جیا، میرنشینێکی پچکۆلانەی خنجیلانەی لاوازی خێڵەکیی، لەو بەشەی بندەستی خۆیدا دامەزراندووە.
لەبری هەر دوو میرنشینەکەی « سۆران » و « بابان »، دوو میرنشینی دیکەی « بارزان » و « تاڵەبان »یان قووتکردۆتەوە، هێندەی دیکە، ڕۆڵەکانی کوردیان، لە یەکدی دابڕیوە، تۆوی دووبەرەکیی، ناکۆکیی و دوژمنایەتییەکی زۆریان، لە نێواندا چاندووە، وایان لێ کردوون، یەکدی بە دوژمنی سەرەکیی بزانن.
تەنانەت، سەردەمێ « 1996 - 2000 » خەڵکی ژێر دەسەڵاتی ئەو دوو میرنشینە، وایان لێهاتبوو، نەیاندەوێرا، بە ئازادیی، سەر لە نێوچەی ژێر دەسەڵاتی میرنشینەکەی دیکە بدەن و خەڵکەکەش، بە گاڵتەپێکردنەوە دەیانگوت: « ڤیزە »مان نییە و ناتوانین، سەرێ لە شاری « هەولێر » بدەین، یا، سەردانێکی « سولەیمانیی » بکەین!
کەچیی، سەیر ئەوەیە، ئەو دوو سەرکردەیە، دان بە دەسەڵاتی یەکدیدا نانێن، بەڵام، لە بەردەم سەرانی عەرەبدا، خۆیان زۆر بە بچووک و گوێڕایەڵ پیشان دەدەن! هەر دوو سەرکردە، داوای یەکێتی خاکی « عێراق » دەکەن، بەڵام، لەگەڵ یەکێتی خاکی « کوردستان »دا نین! هەر دوو سەرکردە، لە پێناوی بەرژەوەندیی دەسەڵات و سەرورەیی دەوڵەتی « عێراق »دا، وازیان لە هێندێ لە مافەکانی کورد هێناوە، بەڵام، وازیان لە بەرژەوەندیی تایبەتیی خۆیان و پارتەکانیان نەهێناوە! هەر دوو میرنشینەکەش، لە ئاستی دەوڵەتی

داگیرکەری « عێراق »دا، خۆیان زۆر بە پچووک دادەنێن، بەڵام، بە چاوێکی سووک و بێ باوەڕەوە، لە یەکدی دەڕوانن!
باوەڕیش ناکەم، هیچ شەهیدێکی سەربەرز و پیرۆزی « کوردستان »، هەرگیز، خەباتی بۆ هەرێمێکی لەتوپەتکراو و دوو میرنشینی لاواز کردبێ! بەڵکوو، گەر ئەو شەهیدانە زیندووکەینەوە و لێیان بپرسین، گومانم نییە، زۆر بە ڕاشکاویی دەڵێن: ئێمە، لە پێناوی رزگارکردن و سەربەخۆیی، هەموو خاکی « باشووری کوردستان » و سەربەستیی هەموو تاکێکی کورددا، گیانی خۆمان بەخشیوە. ئامانجمان، دامەزراندنی دەوڵەتێکی یەکگرتووی بەهێزی « کوردستانیی » بووە! جا ئایا « بارزانیی » و « تاڵەبانیی »، کەی گوێ لە هاواری ڕۆڵەکانی گەل، ناڵەی جەرگسووتاوان و دەنگی شەهیدان دەگرن؟!!

* * *

# 1 گەل و 2 ئاڵا!

ساڵی « 1992 »، سەرکردایەتی « بەرەی کوردستانیی » بڕیاریدا، هەڵبژاردنێ بۆ پەرلەمانی « باشووری کوردستان » سازکا. ئەوەبوو، ئەندامانی پەرلەمان هەڵبژێردران. ئەو کاتە هێشتا، ڕژێمی داگیرکەری فاشیی « بەعس »، لەو پەڕی دەسەڵاتیدا بوو.
لە یەکەمین دانیشتنی پەرلەماندا، چەن دەنگێکی ڕەسەن، لە فراکسیۆنی سەوزی، سەر بە لیستی « یەکێتی نیشتمانیی کوردستان »ەوە بەرزبۆوە. داوایانکرد، ئاڵای دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق »، لە هۆڵی پەرلەمان لابرێ، لەبری ئەوە، ئاڵای « کوردستان » هەڵکرێ! بەڵام، « پارتی دیمۆکراتی کوردستان » دژبوو، نوێنەری فراکسیۆنی زەرد، پێی لە سەر ئەوە داگرت و گوتی: ئێمە، لە دەوڵەتی « عێراق » جیا نەبووینەتەوە. لەبەرئەوە نابێ، ئاڵای « عێراق » لابرێ!
ئیدی، ئاڵا سێ ڕەنگە ئەستێرەدارە ڕەشە تاریکەکەی « عروبە » و « عێراق »، وەک خۆی مایەوە، ئاڵا سێ ڕەنگە جوانە خۆرداره گەشە درەوشاوەکەی « کوردستان »یش پێچرایەوە، لە بوخچەدا هەڵگیرا و چاوی خۆرە زەردەکەشی، خەوی چاوەڕوانیی لێکەوت!
بەڵێ، وەک دەڵێن: ئەم ژیانە بەری کورتە. بۆیە، ڕۆژگار هات و زۆر بە خێرایی تێپەڕی. بەڵام، جگە لە جەنگی چەپەڵی نێوخۆیی، نێوان هەر دوو زلهێزی دەسەڵاتدار « پارتیی » و « یەکێتیی »، هیچ جۆرە شتێکی دیکەی باش و نوێ، لە « کوردستان »دا ڕووی نەدا. تا، ساڵی « 1998 » هات، « پارتیی » ئاڵاکەی دەرهێنایەوە، نوتوویکرد، لە دەفەرەکەی خۆی، لە سەر هەموو تەلار و دەزگەیەکی دەسەڵاتی میرنشینەکەی خۆی، بەرز هەڵیکرد، تا، خەوشی زەق و لەبیرنەچووی « 31 .08 .1996 »ی پێ داپۆشێ و لە بیر خەڵکی نابرووەمەندی کوردی بەرێتەوە!

کەچیی، کاتێ هەموو خاکی « عێـراق »، لە لایەن هێزەکانی هاوپەیمانانەوە داگیـرکـرا، کـاتێ، هەمـوو نێـوچەکـانی دیکەی « باشـووری کـوردسـتـان » ڕزگارکرا، میریی « بەعس » ڕوخا، دیکتـاتۆرەکەی « بەغدا » خۆی شاردەوە، پاشان گیرا و بە تەواویی، ئابڕووی هەموو عەرەبی برد، ئالاکەش، لە هەموو سەرانسـەری « باشووری کوردستان »، بە ڕەزامەندیی « ئەمێریکا » هەڵکرا، تەنانەت، لە سـەر هێندێ « ئوتێل، چێشـتـخـانە، کەبابخـانە، بەڵەم ... ی شارەکانیش هەڵکرا!

بەڵام، لە چانسی ڕەش و کـەچی کـورددا، هـەر دوو هەڵوێسـتـەکە پێـچەوانە بوونەوە. ئەم جارەیان، « پارتیی » قایل نەبوو، ئالای « عێراق »، لە دەفەرەکەی بندەسی خـۆیدا هەڵکرێ و دایگرت. کەچیی، « یەکێتیی » کە پێشتر، هیچ جۆرە ئالایەکی هـەڵ نەکردبوو، ئەم جـــــــارەیان، ڕووە چڵکن و تەڵخە درێژوە « عێراقچێتیی »یەکەی خۆی دەرخستەوە، لە پاڵ ئـــالای ئاڵوواڵای ڕەنگینی « کـوردسـتـان »دا، ئالای ڕەشی « یەکـێـتـیی » نەتەوەی عـەرەب و دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق »ی، لە هەموو نێوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆیدا هەڵکرد، تا دڵسۆزیی خۆی، بۆ برا عـــــــــــەرەبەکانی نوێکاتەوە و پێیان بڵێ: ئێمە، لە « پارتیی » پتر، بڕوامان بە « عێراقچێتیی » هەیە! ئێمە، لە « پارتیی » پتر، یەکێتی خاکی « عێراق » دەپارێزین! ئێمە، لە « پارتیی » پتر، خـۆمـــــــان بە « عێـراقـیی » دەزانین! ئێـمـە، لە « پارتیی » پتـر، خـۆمـان بە برا بچـووک و نۆکەری « عەرەب » دادەنێین!

لەبەرئەوە، ئەز لەو باوەڕەدام، گەر « پارتیی »، ئالای « عێـراق »ی هەڵکردایە، ئەوا ئەو کاتە، « یەکێتیی » هەڵی نەدەکرد و ڕەخنەی توندی لێ دەگرت! هەر وەک چۆن، لە یەکەمین کۆبوونەوەی پەرلەماندا، چەن نوێنەرێکی « یەکێتیی » داوایانکرد، ئالای دەوڵەتی « عێـراق » لابرێ. بەڵام، « پارتیی » قـایل نـەبوو، چونکە، « یەکێتیی » پێشنیازیکردبوو! ئاخر ئەمە دەبێ، کێبڕکێی نێوان ئەو دوو پارتە گەورەیە، لە هەمـوو شـتـێکی باش و خراپدا ڕەنگبداتەوە؟!! ئاخـر نابێ، ئەو دوو سـەرکـردە زرنـگە، بیـرێ لەوە بکەنەوە و بزانن، جگە لە گـەلی کورد، کەسی دیکە، پتر زیانی پێ ناگا؟!!

بەڵێ، « یەکێتیی » لەبری ئالایەک، بە یەک جـار، دوو ئالای هەڵکرد، هەر وەک چۆن، ڕیکۆردی شکاند، هەست و هۆشی، ڕۆڵەکانی گـەلی کوردیشی ڕوشاند! چونکە، ئەو ئالایەی هەڵکرد، کە نەتەوەییە ڕەگەزپەرست و شۆڤێنیستەکانی عەرەب، سالی « 1963 » نەخشەیانکێشا و ڕەنگیانڕشت! ئالای یەکێتی نێوان « میسر، سووریا و عێراق »ی هەڵکرد! ئەو ئالایەی هەڵکرد، کە هیچ جۆرە

ئاماژەیەک، بە بوونی کورد، لە « عێراق »ی برایەتی درۆزنانەی، نێوان کورد و عەرەبدا ناکا! ئەو ئالایەی هەڵکرد، کە هەموو کوردێکی نیشتمانپەروەر و دڵسۆز، قێزی لێ دەبێتەوە! ئەو ئالایەی هەڵکرد، کە سەرۆک « سەددام حوسێن »ی دیکتاتۆر و خوێنڕێژ، بە دەس و پەنجەی خوێناویی و چەپەڵی خۆی، هەر دوو ووشەی پیرۆزی « ئەڵڵاهو ئەکبەر »ی لە نێوان ئەستێرەکانیدا نووسی!

ئاخر، ئەمە وەک ئەوە وایە، « یەکێتیی » دڵی نەهاتبێ، ئەو یادگارە جوانە شیرینە پڕ بایەخەی « یەکێتیی » عەرەب و سەرۆک « سەددام حوسێن »، لە بەر چاوی ئەندامان و ڕۆڵەکانی کورد ونکا! یا، شانازیی بە ئالای دەوڵەتی « عێراق »ەوە بکا و حەزبکا، لە سەر هەموو باڵەخانەیەکی بەرزی میرنشینەکەی بندەسی خۆی بشەکێتەوە! چونکە، لەوە دەچێ، ئەو ئالا ڕەشەی « عرووبە »، هەر دوو تاوانی « ژاربارانی » و « ئەنفال »، بیری ڕۆڵەکانی گەلی کورد نەخەنەوە!!!

ڕاستە، لە سیستێمی « فیدراڵیزم »دا، هەموو هەرێمێکی « فیدراڵ » بۆی هەیە، هەر دوو ئالای دەوڵەتی نێوەندیی و هەرێمەکەی خۆی هەڵکا. بەڵام، پارتە ڕامیارییەکان و میریی هەرێم هەرگیز نابێ، ئەو ئالا ڕەشەی « عروبە » لە « کوردستان » هەڵکەن، کە هیچ نیشانەیەکی نەتەوەیی، بوونی کوردی لە « عێراق »دا تێدا نییە!

بە داخەوە، سەرکردە و پارتە ڕامیارییەکانی هەموو گەل و نەتەوەکانی جیهان، هەمیشە خواخوایانبووە، ئالایەکی یەکگرتوویان هەبێ، سیمبۆلی نەتەوە و نیشتمانەکانیان بێ، هێندە بەرز هەڵیکەن، تا، لە ئاسمانی وولاتەکانیاندا، بە ئازادیی بشەکێتەوە.

کەچیی، وا دیارە، سەرانی ئەو دوو پارتەی « باشووری کوردستان »، دڵیان بە یەک ئالا، ناوی نەخواردبێتەوە و کوردیان، بە زۆرلێکراو زانیبێ، گەر یەک ئالای یەکگرتووی هەبێ! بۆیە، لەبری یەک ئالا، دوو ئالایان بۆ هەڵکردووە! ئەمە ئەوە دەردەخا، هەر دوو پارت، هەمیشە، « مزایدە » لە سەر یەکدی بکەن، تا، هەست و سۆزی ڕۆڵەکانی کورد، بە لای خۆیاندا ڕاکێشن و کورتیی دەسەڵات بەرنەوە! جا، ئایندەی کورد و ئەزموونەکەی « کوردستان »یش، چی بەسەردێ، ئەوە لای ئەوان، زۆر گرنگ نییە!

ئاخر، لە سەردەمی فرمانڕەوایی « شێخ مەحموودی حەفید »دا بوو، ڕۆژی « 1922. 09. 17 »، بۆ یەکەمین جار لە مێژووی کورددا، لە سەر قشڵەی سوپایی شاری « سولەیمانیی »، لە نێو کۆڕی گوتارخوێندنەوە، هارەی

چەپڵەڕێزان، دەنگی تەقەوتۆق و ئاگردانی چەکدا، ئاڵای « کوردستان » هەڵکراوە، ئەو کاتە، ڕۆڵە دڵسۆز و بە ئەمەکەکانی کورد، گۆرانییان بۆ چڕیوە و گوتوویانە:
با بلەری، با بلەری، بەیداخی کورد
دایچەقێنە، دایچەقێنە، بەیداخی کورد
کەچی، دوای پتر لە هەشتا ساڵ، تازە سەرانی « یەکێتیی » دەیانەوێ، ڕۆڵەکانی گەلی کورد لە « باشوور »دا فێرکەن، گۆرانیی « با بلەری »، بۆ ئاڵای دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق » بڵێن، ئەو دەوڵەتە بێ ڕەوشتەی، لە فەرهەنگی داگیرکردن و چەوساندنەوەی نەتەوایەتییدا، هیچ شتێکی خراپ نەما، تا بە کوردی بکا!

* * *

# 3 جۆر سەرکردە!

کاتێ، جەنگی ڕۆژی « 1967. 06. 05 » ، لە نێوان « عەرەب » و « جوو »دا تەواوبوو، کە لە مێژووی عەرەبدا، بە « جەنگی شەش ڕۆژ »ەکە ناسراوە، سوپای « میسر » تێکشکا و دەوڵەتی « ئیسرائیل »یش، سەرکەوتنێکی مەزنی بەدەستهێنا. لەبەرئەوە، سەرۆک « جەمال عەبدولناصر »، یەکسەر، وازی لە هەموو دەسەڵاتێکی پارت و دەوڵەت هێنا. ئەوەبوو، زۆربەی ڕۆڵەکانی گەلی عەرەبی « میسر » کۆبوونەوە، لە سەر جادە و شەقامەکان، خۆپیشاندانیان سازکرد، داوایان لە سەرۆک « ناصر » کرد، واز لەو بیرە بێنێ و بەجێیان نەهێڵێ. ئەویش، بە وردییەکی بەرز، باوەڕێکی پتەو و هەوڵێکی دڵسۆزانەوە، بەڵێنی خەباتی بۆ نوێکردنەوە و لە بڕیارەکەی خۆی پاشگەزبووە!

« **سیلڤادۆر ئەلێندی** »، لە کاتێکدا، بە شێوازێکی دیمۆکراسیی و بە مافی ڕەوای خۆی، لە هەڵبژاردندا دەرچووبوو، ڕۆڵەکانی گەلی « چیللیی »، باوەڕی تەواوی خۆیان دابوویە و هەڵیانبژاردبوو، هێزە فاشستە کۆنەپەرستەکانی نێوخۆ، بە سەرکردایەتی « پینۆچێت » و بە یارمەتیی ئیمپریالیزمی جیهانخۆری « ئەمیریکا »، ساڵی « 1973 »، پەلاماریاندا، نەیانهێشت، فرمانڕەوایی گەل بچەسپێ و کوشتیان. ئەو کەڵەپیاوە مەزنە، سوور دەیزانی، بەو ژمارە کەمەوە، بەرانبەر ئەو هەموو هێزە گەورەیەی سوپا و زلهێزێکی وەک « ئەمیریکا »، هیچی پێ ناکرێ و ناتوانێ، بەرانبەر ئەو هەموو چەکە زۆر و مۆدێرنانە بوەستێ. کەچیی، خۆی بەدەستەوە نەدا، هەڵ نەهات، هەڤاڵەکانی و نیشتمانەکەی خۆی بەجێ نەهێشت، بەڵکوو جەنگا، تا کوژرا!

« سەددام حوسێن » ی دیکتاتۆر، لە مێژووی ڕەشی دەسەڵاتی خۆی و پارتەکەیدا، سێ جەنگی گەورە و ماڵوێرانکارانەی وەک جەنگی: « عێراق ـ کوردستان، عێراق ـ ئێران، عێراق ـ کوێت » ی هەڵگیرساندووە و لە هەر سێ جەنگەکەشدا، سوپاکەی تێکشکاوە و ڕوخاوە. بە هەموو جەنگەکانیش، نزیکەی دوو میلیۆن مرۆی تێدا کوژراوە. کەچی، چونکە تینوێتی بە خوێن دەشکا، پەندی لە مێژوو وەر نەدەگرت، چار لە دوای چاریش، لە سەر کەللەشەقیی و خوێنڕشتنی خۆی سووربوو!

بۆیە، پێش ئەوەی، ساڵی « 2003 »، جەنگ لە نێوان دەوڵەتێکی زلهێزی وەک « ئەمریکا » و « عێراق » دا دەستپێبکا، چەندین سەرکردەی عەرەب و دەوڵەتەکانی دیکەی جیهان، چ بە نهێنیی و چ بە ئاشکرا، داوایان لێ کرد، واز لە پۆستی سەرۆک کۆمار بێنێ، خۆی و خێزانەکەی، بۆ کوێ بیانەوێ، ڕێیانبدەن، بارکەن، بڕۆن و وەک پەنابەری رامیاریی، لەوێ بژین.

هەرچەندە، « سەددام » سوور دەیزانی، ئەم جارە « ئەمریکا »، بە ڕاستیتی، وازی لێ ناهێنێ، هێزەکانی هاوپەیمان لێیدەدەن و هیچیشی پێ ناکرێ. کەچی، هێندە دڵسۆز و بە ئەمەک نەبوو، خوێنی ڕۆڵەکانی عەرەب، بە خۆڕایی نەڕێژێ، وازبێنێ و سەری خۆی هەڵگرێ. بەڵکوو، زۆر بە ئاسانیی دەیتوانی، لە لایەکەوە، سەری خۆی و خێزانەکەی دەرکا و بەو چارەنووسە ڕەشە نەبگا! لە لایەکی دیکەشەوە، ڕۆڵەکانی گەلانی « عێراق »، تووشی ئەو جەنگە کاولکارانەیە نەکا. بەڵام، هەر ملی‌نەدا و لە سەر کەللەڕەقیی خۆی بەردەوامبوو، تا، جەنگەکە ڕوویدا، سوپاکەی تێکشکێنرا، وڵاتەکەی داگیرکرا، دەوڵەتەکەی هەڵوەشێنرایەوە، پارتەکەی قەدەغەکرا، خۆی گیرا، ژن و کچەکانی دەربەدەربوون، کوڕەکانی کوژران، باری ڕۆڵەکانی گەلی عەرەب لە « عێراق » دا، خراپتربوو، هەراوئاژاوەیەکی واشی لێ کەوتەوە، مەگەر هەر خوا بە گەورەیی خۆی بزانێ، کەی کۆتایی‌دێ! مەگەر هەر خواش بۆ خۆی بتوانێ، چارەسەریبکا!

خۆزگە، سەرکردەکانی کوردیش، سەرنجیکی ئەو سێ نموونەیەیان بدایە، پەندیکیان لێ وەرگرتایە، هێندە لەخۆبووردوو و ئازا بوونایە، تەنیا بۆ جارێ، دانیان بە هەڵەکانی خۆیاندا بنایە. گەر وەک « ناصر »، وازیان نەهێنایە، ڕێیان بە خەڵکی دیکە بدایە، لە کاری نەتەوەیی و ڕامیاریی، لە چارەنووسی گەلی کورد و ئاییندەی « باشووری کوردستان » دا، دەستیان هەبووایە و بڕیاریانبدایە. یا، وازیانبێنایە و گۆڕەپانەکەیان، بۆ ئەوەی نوێی کورد چۆڵکردایە!

یا، گەر وەک « سیلڤادۆر ئەلیندیی »، بڕیاریاندابێ، لە پێناوی ئامانجە ڕەواکانی گەلدا، تا، دوا دڵۆپی خوێن هەوڵ بۆ کورد بدەن و بکۆشن، لە تەنگانەدا، گەلەکەیان بەجێ نەهێڵن، ئـــــەوا، هەر لە ئێستەوە دەڵێم: دەک بڕوانامەی « شەهادە »تان پیرۆزبێ!
بەلام گەر نیازیان وابێ، تا دوا هەناسەی ژیانیان، وەک « سەددام حوسێن »، دەس بە قولفی کورسیی دەسەلاتەوە بگرن، هیچ جۆرە لێکدانەوەیەک، بۆ بەرژەوەندیی بالای کورد نەکەن، دەبا چارەنووسی ئەویان لەبەرچاوبێ!

# زمانی ماتماتیک

**عێراق** :
جوگرافیای عێراق = عەرەبستان + باشووری کوردستان.
پانتایی خاک = عێراق ـ باشووری کوردستان « 000 .435 ـــ 000 .87 = 000 .348 کیلۆمەتری چوارگۆشە ».
ژمارەی دانیشتووان = ؟؟؟
ژمارەی پارێزگەکان = 13.
گرووپە ئیتنیکەکانی عێراق = هەر دوو گەلی « عەرەب + کورد » + کەمەنەتەوەیی « توورکمان + ئاشوور + ئەرمەن + کلدان ».
عێراق ـ باشووری کوردستان = بەشێ لە نیشتمانی عەرەب. « عەرەبستانی عێراق = بەشێ لە نیشتمانی عەرەب ».
عەرەبی عێراق ـ « کورد + کەمەنەتەوەیی »یەکانی عێراق = بەشێ لە نەتەوەی عەرەب.
ئاین = ئیسلام + فەلە + جوو + صابئە.
ئایینزا = شیعە + سووننە.
میریی عێراق = سووننە + شیعە + کورد.
پێتەخت = یەک شار « بەغدا ».
پارتەکانی عێراق = 1 + 000
دەسەڵاتی عێراق ـ « سوپا + پۆلیس + دەزگەی سیخوڕیی » = 0
عێراقێکی دیکتاتۆریی و شۆڤێنیست = هێزەکانی « سوپا + پۆلیس + دەزگەی سیخوڕیی ».

**باشووری کوردستان** :
جوگرافیای باشووری کوردستان = « زاخۆ » ←――― « خانەقین ».
پانتایی خاک = 000 .87 کیلۆمەتری چوارگۆشە.
ژمارەی دانیشتووان = ؟؟؟
ژمارەی پارێزگەکان = 5 « مووسڵ + کەرکووک + هەولێر + سولەیمانیی + دهۆک ».

گرووپە ئیتنیکەکانی باشوور = گەلی کورد + کەمینەنەتەوەیی « توورکمان + عەرەب + ئاشوور + ئەرمەن + کلدان ».
باشووری کوردستان = بەشێ لە کوردستانی مەزن.
گەلی کورد لە باشووری کوردستان = بەشێ لە نەتەوەی کورد. « گەلی کورد لە عێراق = بەشێ لە نەتەوەی کورد ».
ئاین = ئیسلام + فەلە + جوو + یەزدیی + کاکەیی.
ئاینزا = شیعە + سووننە + هەقە.
میریی هەرێم = دوو بەڕێوەبەرایەتی « پارتیی » + « یەکێتیی ».
پێتەخت = دوو شار « هەولێر » + « سولەیمانیی ».
پارتەکانی هەرێم = پارتیی + یەکێتیی + کۆمەڵێ پارتی پچووکی سەر بەو دووانە!
گەلی کورد لە باشووری کوردستان = « پارتیی + یەکێتیی » ـــ یەکێتی ڕیزەکانی گەل.
ئاسایشی نەتەوەیی گەلی کورد لە باشوور = سوپای یەکگرتوو + پۆلیسی یەکگرتوو + ئاسایشی یەکگرتوو.
بەرەی کوردستانیی = کوردستانێکی ئارام و ئازاد + ئایندەیەکی گەش.
دیکتاتۆریی تاک و پارت = بتپەرستیی + چەوساندنەوە + ڕاونان + گرتن + ئازاردان + کوشتنوبڕین + ناکۆکیی + دووبەرەکیی + جەنگی نێوخۆ + ناپاکیی + کاولکاریی + هەلپەرستیی + تالانیی + دزیی + ماستاوساردکردنەوە + تێداچوونی کورد و ئەزموونەکەی!
دیمۆکراسیی = فرمانڕەوایی گەل + ئازادیی + هەڵبژاردن + یەکێتیی + تەبایی + نیشتمانپەروەریی + سەرکەوتن + خۆشیی + ئاوەدانکردنەوە + پێشکەوتن + گەشەکردن.
پارتیی ـ بنەماڵەی بارزانیی = – 0
یەکێتیی ـ جەلال تاڵەبانیی = + 1

* * *

# « دڵ » و « قودس »

ژەنەڕاڵ « مستەفا بارزانیی »، شـاری « کەرکووک »ی بە « دڵ » داناوە و « جەلال تاڵەبانیی »ش، بە « قودس »ی چواندووە. لە ڕاستییدا، ئەز هیچ کاتێ، گوێم لێ نەبووە و لە هیچ شوێنێکیشدا نەمخوێندۆتەوە، گەر یەکەمیان گوتبێتی، یا نووسیبێتی: « کەرکووک دڵی کوردستانە ». لەگەڵ ئەوەشدا، ئەوەکانی خۆی و ئەندامانی پارتەکەی وا دەڵێن! بەلام، گەلێ جار، گوێم لە دووەمیان بووە و خوێندووشمەتەوە، لە قسە و نووسینەکانیدا، « کەرکووک »ی بە « قودس »ی « کوردستان » داناوە!
ئەز پێم وایە، « تاڵەبانیی » بۆیە، شاری « کەرکووک »ی بە « قودس » داناوە، چونکە، پێشتر « بارزانیی » باوک، ئەو شارەی بە « دڵ » ناوبردووە و تازە زاراوەکە گیراوە، خۆ ناشبێ، شتێ ئەو گوتبێتی و گرتبێتی، ئەم دووبارەی کاتەوە و داگیریکا! چونکە، عەرەب وتەنی: دووبارەکردنەوە ناشیرینە، گەر جوانیشبێ! *
هەڵبەتە، هیچ مرۆیەک، بێ « دڵ » ناتوانێ، بژی. چونکە، هەر کاتێ، « دڵ » بەکیکەوت، مرۆ ڕەنگی زەردهەڵدەگەڕێ، چاوی زەقدەبێ، سەری دەئاوسێ، ملی دەماسێ، پێستی شیندەبێتەوە، بۆگەندەکا، لاردەبێتەوە، لنگی جووتدەکا و دەمرێ! هەروەها، « کوردستان »یش بێ « کەرکووک »، وەک « سۆماڵ »ی لێدێ و ناتوانێ، بژی! چونکە، ڕۆڵەکانی گەلی کورد، لە « باشووری کوردستان » دەبێ، لە ماڵی خۆیاندا، شتەکانی خۆیان، بە پارەی خۆیان بکڕن!

ئاخر، پارێزگەی «کەرکووک»، جگە لەوەی، لە نێو جەرگەی «باشووری کوردستان»دا هەڵکەوتووە، بە سەرچاوەیەکی گەلێ دەوڵەمەندی پڕ لە فەڕ و بە پیتیش دادەنرێ. چۆن «دڵ»، خوێن بۆ هەموو ئەندامەکانی جەستەی دیکەی مرۆ دەنێرێ، هەروەها «کەرکووک»یش، «زێڕی ڕەش»، بۆ هەموو کونوقوژبنێکی «باشووری کوردستان» دەنێرێ! کەچیی، «کوردستان» بێ «قودس» دەتوانێ، بژی. چونکە «قودس»، نەک هەر بەشێ لە هیچ پارچەیەکی «کوردستان» پێک ناهێنێ، بەڵکوو، هیچیش بە کورد نابەخشێ!
جگە لەوەی، چارەنووسی شاری «قودس»، لە نێو لەپی بێوی چەکی ئەتۆمییدا حەشاردراوە، هەر خەریکە بە تەواوییش، لە دەس ڕۆڵەکانی گەلی عەرەبی «فلەستین» دەچێ، گەر هی ئەوانیش بێ! # لەبەرئەوە، هەر وەک چۆن، عەرەبەکان بە گشتیی و عەرەبی «فلەستین» بە تایبەتیی، شاری «قودس»یان بۆ داگیر ناکرێتەوە، «تاڵەبانیی»ش باش دەزانێ، پارێزگەی «کەرکووک»ی بۆ ناسەندرێتەوە. بۆیە، سەرەدەمێ بە «قودس»ی دەچوێنێ و ئێستەش، بە شاری «برایەتیی» نێودەبا!
با بزانین، کەی سەرکردەی هەر دوو پارت، ئامانجی سەرەکیی، هەموو ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد بە گشتیی، گەلی کورد لە «باشووری کوردستان» بە تایبەتیی و کوردەکانی شاری «کەرکووک» بە تایبەتییتر، بەدەستدێنن؟!! کەی خاوەنەکانیان، بە ڕاست دەگەڕێ؟!! کەی زەوی، بۆ خاوەن ماڵ دەگەڕێتەوە؟!! کەی عەرەبە چێنراوەکان، هەڵدەکەنرێن؟!! کەی ئاوارەکان، بۆ سەر زێد و نیشتمانی خۆیان دەگەڕێنەوە؟!! کەی هەموو جۆرە ناخۆشیی و بەلایەک کۆتاییپێدێ؟!! کەی «دڵ»ە گەورەکەی «کوردستان»، لە دەس نەشتەرگەریی و لە ژووری ژیاندنەوە قوتاریدەبێ؟!! کەی شاری «قودس»ی «کوردستان»، لە دەس عەرەبە «ئیسرایلیی»یەکان، بە تەواویی ڕزگاری دەبێ؟!!! کەی، کەی، کەی و کەی، کوردی شاری «کەرکووک»، وەک مرۆ دەژین؟!!
لە کۆتاییشدا، هەر ئەوە ماوە، بڵێم: دەبا شارەکەی «بابەگوڕگوڕ»، نە «دڵ» و نە «قودس» بێ، بەڵکوو، تەنیا هەر «کەرکووک»ی ڕووتبێ. بەڵام، لە «مزاهیدە»یەکی نێوان «پارتیی» و «یەکێتیی»دا، لەکیس کورد نەچێ!

* * *

**تێبینییەکان:**

* التكرار قبيح و لو كان مليح.

# ئەز بە هەمبوو باوەڕێکەوە دەڵێم: « قودس »، شارێکی عەرەبی نییە، بەڵکوو، شاری جوولەکانە. چونکە، جوولەکان پێش زایین و لە سەردەمی « نیرۆن »دا توانییان، هەموو خاکی « فلەستین » داگیرکەن و دەولەتەکەشیان تێکدەن. دواتریش، ساڵی « 70 »ی زایینی، شاری « قودس »یان، بە تەواوی داگیرکرد. پاشـــــان، عەرەبە موسوڵمانەکان هاتوون، هەموو خاکی « فلەستین »یان داگیرکردووە. بەڵام، جوولەکان جارێکی دیکە توانییان، ساڵی « 1948 »، لە سەر خاکی مێژوویی خۆیان، دەولەتی « ئیسرایل » دامەزرێنن و ساڵی « 1967 »یش، بۆ دووەمین جار لە مێژوودا، شاری « قودس » ڕزگارکەن و لە عەرەبەکانی بسەننەوە! واتە: جوولەکان پێش عەرەبەکان، لە سەر خاکی « فلەستین » بە گشتیی و لە نێو شاری « قودس » بە تایبەتیی ژیاون. لەبەرئەوە، لە ڕووی مێژووییەوە، بە شارێکی عەرەبیی نازمێررێ. بەڵام، چونکە نەتەوەی عەرەب، لە ژێر پەردەی ئایینی ئیـــسلامدا، زۆربەی وڵاتانی جیهانیان داگیرکردووە، هەر بە هی خۆیانی دەزانن. هەر وەک چۆن، هەر لە کۆنەوە تا ئەورۆ، هەر دوو « باشوور و خۆرئاوای کوردستان »یان داگیرکردووە، بە خاکی خۆیانی دادەنێن و بە هی کوردی نازانن!

« بۆ زانیاریی پتر، تەماشای ئەم بەرهەمەی نووسەر بکە: کورد و شۆڕش و هەڵی مێژوویی، چاپ 2، کوردستان ـ سولەیمانیی، 2000، لاپەڕە 306 - 307 ».

# کێشەی « کەرکووک »
# لە نێوان « پارتیی » و « یەکێتیی » دا

هەر لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ، هەمیشە، ئاواتی هەرە گەورەی، هەموو کوردێکی نیشتمانپەروەر، کوردپەروەر، دڵسۆز و بە ئەمەک ئەوەبووە، ڕۆژێ لە ڕۆژان، شاری « کەرکووک » و نێوچەکانی دیکەی بەعەرەبکرابوون، ڕزگارکرێن و لە چوارچێوەی سنووری هەرێمی « باشووری کوردستان »دا ڕێکخرێنەوە، دەستی ئاوەدانکردنەوە و شارستانێتییان بگاتێ، ئاڵای « کوردستان »، بە سەر تەلار و باڵەخانە بەرزەکانییەوە بشەکێتەوە، کۆتایی بە هەموو جۆرە زۆردارییەکی نەتەوەیی بهێنرێ و هەموو عەرەبە هاوردەکان، بۆ زێد و نیشتمانی تایبەتیی خۆیان بگەڕێنەوە!

بەڵام مەخابن، ئەم ئاواتە، وەک چاوەڕێماندەکرد، بە ڕووخاندنی ڕژێمی فاشیی « بەعس » و دەسگیرکردنی « سەددام »ی دیکتاتۆریش نەهاتەدی! هەرچەندە، هەلێکی مێژوویی باش، بۆ ئەو کارە ڕەخسا، کەچیی، سەرانی کورد لەکیسیاندا! با بزانین، چۆن؟

ئێمە، هەموو لەو باوەڕەدا بووین، تا ڕژێمی « بەعس » بە گشتیی و « سەددام حوسێن » بە تایبەتیی بمێنن، دەبێ، دەس لە « کەرکووک » و هەموو نێوچە بەعەرەبکراوەکانی دیکەی « باشووری کوردستان » بشۆین. بۆیە، گرێومان لە سەر ڕووخاندنی ڕژێمی « بەعس » دەکرد، تا، ئەو نێوچانەمان دەسکەوێتەوە. ئەمەش، هەر وا بە خۆڕایی نەبوو، چونکە لەو بارەیەوە، ئەزموونێکی بچکۆلانەمان هەبوو. بۆ نموونە: کاتێ، دووەمین جەنگی کەنداو « عێراق ـ کوێت » ڕوویدا، ڕۆڵەکانی گەلی کورد ڕاپەڕین، شاری « کەرکووک » و زۆر نێوچەی دیکەشیان ئازادکرد. بۆ؟ چونکە، هێزی پێشمەرگەی « کوردستان » یەکبوو، « بەرەی کوردستانیی » هەبوو، جاش و باشیش هەموو پێکەوە، بۆ کورد هەوڵیاندەدا. هەر هێندە « کەرکووک »یش ڕزگارکرا، هەرچی عەرەبی

دەشتەکیی و خێڵەکیی هەبوو، بە چەکدار و بێ چەکیشەوە، گیانی خۆیان و خێزانەکانیان دەرکرد و شاریان چۆڵکرد! هێزەکانی پێشمەرگە، بێ قرە و برە، قەڵای قایمی شاریان گرتدا!
بەڵام، کاتێ «ئەمێریکا»، لە پێناوی بەرژەوەندیی چەپەڵی تایبەتیی خۆیدا، کەلەپچەی دەس و پێی، هێزەکانی دەوڵەتی داگیرکەری «عێراق» و سەرانی پارتی «بەعس»ی کردەوە، سوپا ترسنۆکەکەی «بەعس»ی فاشیست، وەک گوورگی هاری چاوبرسیی، لە پێشدا پەلاماری «کەرکووک» و دواتریش پەلاماری هەموو «کوردستان»یان دایەوە، سەرلەنوێ داگیریانکردەوە، بە درندانەترین شێوە، ڕاپەڕینەکەیان سەرکوتکرد، لە خوێن و فرمێسکیان هەڵکێشا.
ئەو ئەزموونە خۆش و ناخۆشە، ئەو خەونە شیرین و تاڵە، هەر وا لە یادەوەریی ڕۆڵەکانی گەلی کورددا مایەوە. لەبەرئەوە، هەموو کوردێکی دڵسۆز، بیری لەوە دەکردەوە، هەڵێکی دیکەی مێژوویی بۆ کورد هەڵکەوێ، تا، شاری «کەرکووک» و نێوچەکانی دیکەی بندەستی «بەعس» ڕزگارکەنەوە. زۆر بە بێ ئارامیی، چاوەڕوانی ئەوەبوون، گەر «ئەمێریکا»، پەلاماری هێزەکانی «عێراق» بداتەوە، واز لە ڕژێمی «بەعس» و «سەددام» نەهێنێ، تا دەیروخێنێ، ئەم جارە، شاری «کەرکووک» و هەموو «کوردستان»، بە تەواویی ڕزگاردەکرێ. هەموو عەرەبەکانیش هەڵدێن و شار بەجێدێڵن!
بەڵێ، ئەوەی خەونمان پێوە دەبینی، هاتەدی. ئەوەبوو، هێزەکانی «ئەمێریکا» و هاوپەیمانەکانی، جەنگیان دژی دەوڵەتی «عێراق» ڕاگەیاند و پەلاماریاندا، ڕژێمی «بەعس»کەوت و هەر لە «عێراق»یشدا قەدەغەکرا! دواتریش، دیکتاتۆرە ترسنۆکەکەی سەرۆکی نەتەوەیی عەرەب، لە ژێر زەویدا خۆی حەشاردا. بەڵام، هێزەکانی «ئەمێریکا»، وەک مشکێکی تۆپیو، بە پەڕۆیەکی پیس، کلکیان گرت، لە کون دەریانهێنا و گرتیان!
کەچیی، ئەم جارەیان، ئەوەی سەرانی کورد نەیانکرد، ئەوەبوو، لە ماوەیەکی کەم و کورتدا، کێشە ستراتیژیی و چارەنووسسازە گرنگەکەی کورد، یەکلایی کەنەوە، هەموو نێوچەکان ڕزگارکەن، بە هەر شێوەیە بێ، دەستێکی باش، لە عەرەبە چێنراوە چەکدارەکان بوەشێنن، بیانتۆقێنن، ڕاویاننێن، دەریانکەن و بۆ وڵاتی خۆیان بگەڕێنەوە.
ئەز، زۆر لەوە دڵنیام، گەر سەرانی هەر دوو پارتی گەورە، نەخشەیەکی باش و ڕێکوپێکیان، بۆ ڕزگارکردنی «کەرکووک» بکێشایە، هێزێکی یەکگرتووی مەشقپێکراوی ئازای پێشمەرگە، پەلاماری شوێنە گرنگ و

بەعەرەبکراوەکانیان بدایە، لە ماوەی یەک دوو ڕۆژدا، دەستێکی باشیان لێ بوەشاندنایە، هەموو عەرەبەکانیان، لە « کەرکووک » ڕاونایە، نە لێپرسراوانی « ئەمێریکا » و هێزەکانی هاوپەیمان قسەیاندەکرد، نە عەرەبەکان خۆیان بەرگرییان بۆ دەکرا و نە دەشیانتوانی، جارێکی دیکە بگەڕێنەوە. چونکە، تازە ئەو باوکەیان مردبوو، پارەتییانبدا و بەزۆر بیانگەڕێنێتەوە!
سەیر ئەوەیە، سەرانی « پارتیی » و « یەکێتیی »، وەک ئەو پلانەیان نەبوو، ئەو کارەیان ئەنجام نەدا، بە پەلە خۆیان گەیاندە « کەرکووک » و نەیانهێشت، کوردە ستەمدیدە دەرکراوەکانیش، تۆڵەی خۆیان، لە عەرەبە هاوردەکان بسەننەوە، پەلاماریانبدەن و ڕاویاننێن، چونکە، مەبەستیان خاوێن و ئامانجیان ڕزگارکردنی « کەرکووک » نەبوو!
ئاخر، وەک دەریان نەکردن و ڕاویشیان نەنان، لەبری ئەوە، خەریکی دزیی و تالانیی بوون! بۆیە، زۆر بە ڕاشکاویی دەیانگوت: « کەرکووک » شاری هەمووانە، هەموو کەس بۆی هەیە، بمێنێتەوە و تێیدا بژی! تەنانەت، ئەندامانی پەلیتبیرۆی « یەکێتیی »، سەرۆک تیرە و هۆزە عەرەبە هێنراوە داگیرکەرەکانی پارێزگەی « کەرکووک »یان دەکرد، دڵنیایان دەکردنەوە، کە کوردی داگیرکراو و عەرەبی داگیرکەر، هەر بران و هیچ هێزێ نییە، بەردی بنچینەی، ئەو برایەتییە درۆزنانەیە هەڵوەشێنێتەوە! لەبەرئەوە، هەر کەسێ، لە ماڵی خۆی دانیشێ، ترسی نەبێ و کەس زیانیان پێ ناگەیەنێ!
ئەوە لە کاتێکدا، سەرکردەی هەر دوو پارتی گەورە و دەسەڵاتدار، بە هەزاران خێزانی کوردیان، لە نێوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە، بۆ نێوچەیەکی دیکەی « باشووری کوردستان » دەرکردبوو، دەستیان بە سەر ماڵ و خانووەکانیاندا گرتبوو، هەر لەبەرئەوەی، سەر بە پارتەکەی خۆیان نەبوون! ئایا، ئەو هەوادار و ئەندامانەی « پارتیی » و « یەکێتیی »، کورد نەبوون، وا لە زێدی خۆیان هەڵیاندەکەندن؟!! ئایا، تەنیا هەر کورد و عەرەب بران، کورد و کورد برا نین؟!!
هەڵبەتە، مێژووی کورد، زۆر بە ڕاستیی، ڕووداوە خوێناویی و جەنگەکانی نێوخۆی کوردی تۆمارکردووە، گەواهیی ئەوەمان بۆ دەدا، کورد هەمیشە، لە نێوخۆدا و بۆ یەکدی لەنێوبردن، ئازا و چاونەترس بوون، بەڵام، بەرانبەر دوژمن، یا لێبووردەبوون، یا ترسنۆک و نۆکەربوون. گەر چاوێ بە لاپەڕەکانی « شەرەفنامە »دا بخشێنین، ئەوا، ڕاستیی ئەم بۆچوونەمان بۆ دەردەکەوێ و زۆر بە ئاشکرا دەبینین: ئەوەتەی ئەم نەتەوەیە هەیە، هەر کورد، کوردی

کوشتووە، گەلێ جار، دەسی دوژمنەکەی خۆی گرتووە، بۆ سەر نەیارە کوردەکەی خۆی بردووە و پەلاماریداوە. هێندێ جاریش، باوک، کوڕی دەربەڕاندووە و کوڕیش، باوکی خۆی لە گرتووخانە توندکردووە. مام، برازای خۆی خستۆتە داوەوە و برازاش، مامی سەربڕیوە. خاڵ، خوارزای خۆی کوشتووە و خوارزاش، چاوی خاڵی خۆی هەڵکۆڵیەوە ...
سەیر ئەوەیە، هەر دوو سەرکردایەتی « پارتیی » و « یەکێتیی »، لە سەر ئەوە ڕێککەوتبوون، ئەنجوومەنی شار دامەزرێنن، گرووپە ئیتنیکەکانی « کورد، عەرەب و توورکمان »، وەک یەک، ئەندامیان لە ئەنجوومەنەکەدا هەبێ! ئاخر، کەمینەی « توورکمان » ئەوەتەی هەیە، چ لە « کوردستان » و چ لە « عێراق »، هەر بە کەمەنەتەوەیی دانراوە. چونکە، یەک بست خاکیان لە هەر دوو وڵاتەکەدا نییە. بەڵام، سەرانی « یەکێتیی »، لە دووەمین کۆنگرەیاندا، بە « گەل »یان دانان، تا، لە سەر حسێبی ڕۆڵەکانی کورد، هەست و سۆزیان، بە لای خۆیاندا ڕاکێشن!*
هەموومان دەزانین، عەرەبەکانی « کەرکووک »، لە سەردەمە جیاجیاکانی دەسەڵاتی دەوڵەتی « عێراق »دا هێنراون، لە شاری « کەرکووک » چێنراون و داگیرکەر نەبن، هیچ جۆرە خەسڵەتێکی دیکەیان نییە!
ئیدی چۆن دەبێ، « توورکمان » کە خاکیان نییە، عەرەب کە داگیرکەرن، لە شاری « کەرکووک »، شان لە شانی کورد بدەن و وەک یەک، کورسییان بە سەردا دابەشکرێ؟!! ئاخر، گەر ئەوە ساویلکەیی نەبێ، چی دیکەی پێ دەگوترێ؟! گەر ئەوە هەل لەدەسدان نەبێ، چ ناوێکی دیکەی لێ بنێین؟!!!
سەیر ئەوەیە، ئێستەش لەگەڵ عەرەبەکاندا، لە سەر ئەوە پێکهاتوون، تا، سەرژمێری گشتیی و هەڵبژاردن نەکرێ، کێشەی « کەرکووک »، هەر وا بە ئاڵۆزیی و تەماویی بهێڵرێتەوە! ئاخر، هەرگیز نەبووە و نەبیستراوە، لە جیهاندا، هیچ سەرکردە و پارتێ هەبووبێ، شێر و خەتی، لە سەر پارەی گیرفانی خۆی کردبێ! ئەدی ئەمە، هەمان هەڵە نییە، سەرکردایەتی شۆڕشی « 11/سێپتێمبەر/1961 » کردیان و ئەم سەرکردانەی ئەوڕۆش، دووبارەیدەکەنەوە؟!!
ئەوڕۆ، بە ئاشکرا، مقومقۆی دەنگێ، لە نێوە و دەرەوەی « کوردستان » دەبیسترێ، ئەو دەنگە ناساز و نامۆیە دەیەوێ، بە ناوی دروشمی برایەتی درۆزنانە و پاراستنی دەسکەوتەکانەوە، چارەنووسی شاری « کەرکووک » بخاتە غەرغەرەوە. دانوستان لە سەر ناسنامەی « کەرکووک » بکا، واز لە « کوردستانێتیی » و « کوردێتیی » خاکی « کەرکووک » بێنێ.

لەبەرئەوە، ئەز وەک کوردێکی نیشتمانپەروەر، گەر دەسەڵاتیشم نەبێ، ئەوا دەتوانم، وەک نووسەرێکی بێلایەن، بە نووکی ڕەمی پێنووسە تیژەکەم، ڕۆڵەکانی گەلەکەم هوشیارکەمەوە و داکۆکیی، لە مافە ڕەواکانیان بکەم. بۆیە، بە مافێکی سروشتیی خۆمی دەزانم، زۆر بە توندیی، دژی ئەو دید و بۆچوونانە بوەستمەوە، دەسەکانیان ئاشکراکەم و ئامانجە گڵاوەکانیان، بۆ ڕۆڵەکانی گەلەکەم ڕوونکەمەوە.

لەبەرئەوە، زۆر بە ڕاشکاویی دەڵێم: هەر سەرکردە و پارتێکی « باشووری کوردستان »، نەک هەر واز لە « کەرکووک » بێنێ، بەڵکوو، واز لە یەک بست خاکی « کوردستان »یش بێنێ، لە لاپەڕەکانی مێژووی کورددا، ناپاکیییەکی گەورە و بێ وێنە، بۆ خۆی تۆماردەکا! ئاخر، تا ئێستە، لە سەرانسەری مێژووی نەتەوەی کورددا، یەک سەرکردە نەبووە، وێرابێتی، خۆی لە قەرەی ئەو کێشە گرنگ و ترسناکە بدا، گەر دەسەڵاتیشیان نەبووبێ، خاکەکەیان ڕزگارکەن، ئەوا بێ دەنگبوون و وازیان لە یەک بست خاکی « کوردستان » نەهێناوە! جا ئەوڕۆ، کێ زۆر ئازایە، با ئەو غەدرە گەورەیە، پێش هەموو کەسێ، لە خۆی و دواییش، لە ڕۆڵەکانی گەلەکەی بکا، بە دەسی چەپەڵی خۆی، چاڵی مەرگ، بۆ خۆی و ڕۆڵەکانی کورد هەڵکەنێ!

با لێرەشدا، زۆر بە ڕاشکاویی و ڕوونتر بڵێم: گـــــــەر، هەموو پارتەکانی « کوردستان »یش، لە هەرە پچووکەکەیانەوە بیگرە، تا بە هەرە گەورەکەیان دەگا، کۆبنەوە، بە خراپ، بڕیار لە سەر چارەنووسی « کەرکووک » بدەن، نە بڕیارەکەیان، بە ڕاست و ڕەوا دەژمێررێ، نە ڕۆڵەکانی گەلی کوردیش دەبێ، گوێ لەو جۆرە بڕیارانە بگرن و ڕێزیان لێ بگرن!

پوختەی مەبەست ئەوەیە: ماوەیەکی زۆر، سەرکردەی هەر دوو پارتی گەورە و دەسەڵاتداری « باشووری کوردستان »، گەلێ هاواریان دەکرد، لە ســـــــەر « کوردستانێتیی » شـــــــاری « کەرکووک »، پێیان زۆر دادەگرت. تەنانەت « پارتیی »، لە پرۆژەی « فیدراڵیزم »ەکەی خۆیدا، شاری « کەرکووک »ی، بە پێتەختی هەرێمی « باشووری کوردستان » دانابوو!

کەچیی، ئەو دەنگانە تا دێ، کزولاوازتردەبن. ئەو دید و بۆچوونانە، ڕۆژبەڕۆژ دەگۆڕێن! وەک ئەوەی، ویست و توانای کورد، لە ئاستی هێز و هەڕەشەی داگیرکەراندا، بە جۆکدا هاتبێ! لەبەرئەوە، وا هەستدەکەم، سەرانی ئەو دوو پارتە دەسەڵاتدارە خەریکن، شـــاری « کەرکووک »، لە « دڵ » و « قودس »ی « کوردستان »ەوە بگۆڕن، لەگەڵ شاری « برایەتیی »دا، وەک گەمەی شەترنج، داشبەداشی پێ بکەن! یا هێندێ جار، گوێمان لێ دەبێ، یەکێ لە سەرکردەی

پارتەکان، گوتەی هێندێ لە سەرکردەی عەرەبە شۆڤێنیست و توورکمانە بەکرێگیراوەکانی « میت »ی « توورکیا »، وەک تووتیی دووبارەکەنەوە و بە شارێکی نموونەی « عێراق »ی بچووکی دەچوێنن!
هەڵبەتە، ئەم خۆگونجاندنەی سەرانی ئەو دوو پارتە، لەگەڵ ڕەوشی ڕامیاریی و داواکاریی، سەرانی هەر دوو دەوڵەتی داگیرکەری « توورکیا » و « عێراق »، تەنیا لەوە دەچێ، خەباتی نەتەوەیی و کاری ڕامیاریی کوردیی، وەک کاسبیی وابێ، کارێکی باش و پڕ فەڕ بێ، پێویستی بە سەرمایە نەبێ! یا دەبێ، دێوجامەیەکی ڕامیاریی، هێندە ڕەنگین و سەنگین بێ، ڕاوەکەری هەست و هۆشی، ڕۆڵەکانی کوردی پێ بکەن، تا زۆرترین ژمارە، لە دەوری خۆیان و پارتەکانیان کۆکەنەوە! لە هەر دوو بارەکەشدا، تەنیا هەر گەلی کورد بە گشتیی و دانیشتووانی شاری « کەرکووک » بە تایبەتیی، زیان لەو کردارە چەوتانە دەبینن. ئەگینا، شاری « کەرکووک »، هەر چییەکی ناوبنێن، هەر بە بەشێکی هەرە گرنگ و دانەبڕاوی، خاکی « باشووری کوردستان » دادەنرێ. جا لە « کوردستان، عێراق، توورکیا » یا، هەر جێیەکی دیکەی ئەم جیهانەش بێ، گەر بە ڕاستیی، « کەرکووک »، بە پارچەیە لە جەستەی « کوردستان »ی دایکی دابنێین و بە موڵکی تەواوی نەتەوەی کوردی بزانین، دەبێ، بە هیچ شێوەیە، واز لە داواکاریی نەتەوەیی و ئامانجە ستراتیژییەکانی خۆمان نەهێنین! خۆ ناشێ، « کوردستانیێتیی » شاری « کەرکووک »، وەک ئاو و هەوای « زەریای نێوەڕاست » وابێ، بەپێی نێوچە، شار، وڵات و کیشوەر بگۆڕێ، سەرانی کورد، لە هەر شوێنێ بن، بە جۆرێکی جیاواز بدوێن، بەپێی دید و بۆچوونەکان، یا، لە ترسی هەڕەشە و چاوسوورکردنەوەی سەرانی داگیرکەران، باسی « کەرکووک » بکەن!
ئێستە با بزانین، « جەلال تاڵەبانیی »، هەر لە کۆنەوە تا ئەوڕۆ، چی بەرانبەر شاری « کەرکووک » گوتووە؟!! هەڵبەتە، ئاشکرایە، « تاڵەبانیی » هەرگیز، نەک هەر بەرانبەر کێشەی « کەرکووک »، بەڵکوو، بەرانبەر زۆربەی کێشە نەتەوەیی و ڕامیاریی، ستراتیژیی و چارەنووسسازەکان، یەک دید و بۆچوونی نەگۆڕی نەبووە و نییە. بەڵکوو، بەپێی ڕەوشی ڕامیاریی « کوردستان، عێراق، نێوچەکە و جیهان »، دید و بۆچوونی خۆی گۆڕیوە و بە شێوەیەکی بەردەوامیش دەیگۆڕێ. دیارە، ئەمە لە کاری ڕامیارییدا، شتێکی زۆر ڕاستە. بەڵام، لە کاری نەتەوەیی و بڕیاردان، لە سەر کێشەیەکی ستراتیژیی و چارەنووسساز، هەرگیز ڕاست نییە! چونکە گەر لەگەڵ هەر لایەنێکی کوردیی و ناکوردییدا، گفتوگۆ لە سەر دەسەڵاتی خۆی و پارتەکەی بکا، بە چەن

پۆستێکی جیاوازی « شارەوانیی، پارێزگار، شالیار، پەرلەمان، باڵوێز، سەندیکا ... » قایلبێ، هیچ گرنگ نییە و زیان بە کورد ناگەیەنێ. گەر خۆی و پارتەکەشی، زیانی تێدا بکەن. لەبەرئەوەی، لە قۆناغێکی دیکەدا دەتوانێ، لەگەڵ لایەنێکی دیکەی رامیاریدا، پتر دانوستانبکا، پێ داگرێ و پتر نامانجەکانی خۆی و پارتەکەی بەدیبێنێ! بەڵام، لە چەن کێشەیەکی نەتەوەیی ستراتیژیی و چارەنووسسازانەی گرنگی وەک: « دامەزراندنی دەوڵەت، دەستنیشانکردنی سنووری کوردستان، کوردستانێتیی نێوچەکانی کەرکووک، خانەقین، شەنگار، زەمار ... »دا، نەک هەر ئەو، خۆی و پارتەکەشی بۆیان نییە، دانوستانیان لە سەر بکەن، بەڵکوو، هیچ سەرکردە و پارتێکی دیکەش بۆیان نییە، تەنانەت، هەر بیریش لەو کارە بکەنەوە! لەبەرئەوە، « تاڵەبانیی » هەر لە کۆنەوە، دەربارەی کێشەی « کەرکووک »، دید و بۆچوونی تایبەتیی خۆی هەبووە و هێندێ جاریش، ئەو دید و بۆچوونانە، زیانێکی زۆریان، هەم بە خودی خۆی و پارتەکەی، هەم بە کێشەی کوردیش گەیاندووە! بۆ نموونە: لە شەستەکاندا نووسیوێتی: (پێویست ناکا، کێشەی « کەرکووک »، ناکۆکییەک دروستبکا. لەبەرئەوەی، یەکەم: گەلی کورد، دژی جیابوونەوەیە لە « عێراق »، سەروەت و سامانی باکوور و نێوەڕاست و باشووری « عێراق »یش پێویستە، بۆ جەماوەری گەلی زەحمەتکێشی عەرەب و کورد و توورکمان بێ.)«38،1»

دواتریش، هەڵوێستی « تاڵەبانیی » بەرانبەر « کەرکووک »، بەپێی سەردەم و شوێن گۆڕاوە. کاتێ لە شاخ بووە، یا، لە شارەکانی « کوردستان » بووە، « کەرکووک »ی بە شارێکی « کوردستانیی » داناوە. بەڵام، کاتێ لە پێتەختی، یەکێ لە دەوڵەتە داگیرکەرەکان بووبێ و لەگەڵ لێپرسراوانی ئەو دەوڵەتانەدا، گفتوگۆی کردبێ و باسی « کەرکووک » کرابێ، ئەوا، ئەو ناوەی لە بیر خۆی بردۆتەوە!

بۆ نموونە: سالی « 1983 - 1985 »، گفتوگۆی لەگەڵ رژێمی « بەعس » کردووە، لەو رێککەوتننامەیەی لە نێوانیاندا بووە، شاری « کەرکووک »، لە نێوچەی « ئۆتۆنۆمیی »دا نەبووە. بەڵکوو، لە بەشی دووەم و خالی « ج »دا نووسراوە: (نێوچەی ئۆتۆنۆمیی، ئەم پارێزگانەی خوارەوە دەگرێتەوە: ئەربیل، سولەیمانیی و دهۆک.)«246،2»

هەر دوای ئەو گفتوگۆیەش، دوو جاری دیکە، لەگەڵ رۆژنامەی « ئەلئەنباء ئەلکویتیە و ئەلطەلیعە »، چاوپێکەوتنی کردووە، بە هەمان شێوە گوتوویەتی: (شاری کەرکووک، ناکەوێتە نێوچەی « ئۆتۆنۆمیی »یەوە.)«3،25-26»

هەروەها، چەندین جاریش، سەردانی « توورکیا »ی دۆستی هەرە دێرین و خۆشەویستی گەلی کوردی کردووە! هیچ جارێ نەیتوانیوە، باسی کێشەی « کوردستانێتیی » شاری « کەرکووک » بکا، نەبا دڵی برا « توورک »ەکانی لێ بیەشێ! هەر وەک لە دوا سەردانی مانگی « 06. 2004 »دا دەردەکەوێ، زاراوەی « قودس »ەکەی، هەر بە جارێ بیرچۆتەوە، شاری « برایەتیی » جێیکرتۆتەوە!

کەچیی، لە هەمان کاتیشدا، لە « ئەنجوومەنی فرمانڕەوایی کاتیی عێراق »، هەڵوێستێکی دیکەی کوردانەی هەبووە، زۆر ئازایانە و شارەزایانە، داکۆکیی لە « کوردستانێتی کەرکووک »، نێوچە بە عارەبکراوەکانی دیکەی « باشووری کوردستان »، زمانی « کوردیی » و سیستێمی « فیدراڵیزم » کردووە، کە جێی شانازیی و سەربەرزیی، هەموو کوردێکی نیشتمانپەروەری بە ویژدان بوو! هەروەها، هەر چەن ڕۆژێ دوای سەردانەکەی « توورکیا »، لە « ئیتاڵیا »شەوە، زۆر بە ڕاشکاویی ڕایگەیاند و گوتی: « کەرکووک » شارێکی « کوردستان »ە! خۆزگە، ئەو قسە باشانەی دەربارەی « کەرکووک »، لە شاخ و شارەکانی « کوردستان » دەیکا، ئەو سیمینارە گرنگەی، لە « ئەنجوومەنی کاتیی فرمانڕەوایی عێراق » پێشکەشیکرد، لە « توورکیا »ش، هەر هەمان شتی بگوتایە و هەر هەمان سیمیناری پێشکەشکردایە، ڕامیاریی « بانێک و دوو هەوای »، لەگەڵ کورد و سەرانی دەوڵەتە داگیرکەرەکاندا پیادە نەکردایە، تا لە لایەکەوە، ناکۆکیی لە قسەکانیدا نەبووایە. لە لایەکی دیکەشەوە، لە بەردەم گەلانی جیهان و سەرانی داگیرکەری « توورک »دا، ڕۆڵەکانی کوردی، هێندەی دیکە پچووک، سووک، چرووک و ڕیسوا نەکردایە! چونکە، گەر کار وا بڕوا، دەبێ، ڕۆڵەکانی کورد بە گشتیی و کوردی شاری « کەرکووک » بە تایبەتیی، تا ماون، بۆ خۆیان هەر بڵێن: بە جارێ ماڵی وێرانم، « مووسڵ »یشم چوو، « کەرکووک »یشم چوو! #

ئاخر، سەرکردەیەکی مەزنی وەک « مستەفا بارزانیی »، نەک هەر سەرۆکی « پارتیی » بوو، بەڵکوو، هەموو چین و توێژ، ڕێکخراو و پارت، ئایین و ئایینزاکانی « کوردستان »یش، بە سەرۆکی خۆیان دادەنا. کەچیی، ڕۆژێ لە ڕۆژان، هەرگیز، خۆی نووشی لێپرسینەوەیەکی گەورەی مێژوویی، لەو چەشنە نەکرد، تا، واز لە یەک بستی خاکی « کوردستان » بە گشتیی و « کەرکووک » بە تایبەتیی بێنێ. بەڵکوو، ساڵی « 1974 »، لە سەر شاری « کەرکووک »، جەنگی لەگەڵ دەوڵەتێکی بەهێزی وەک « عێراق » و پارتێکی درندەی فاشیی وەک « بەعس » دەسپێکردەوە! پێوەندیی نێوانیانی تێکدا و لەگەڵیان ڕێک

نەکەوت. خۆ گەر ئەو کارەی نەکردایە، ئەوا، کەژاوەی تەخت و نگینی بەختی، بە یەکجاریی تێدا نەدەچوو، دەربەدەری وولاتان نەدەبوو، بە نەخۆشیی و کەساسییش، سەری نەدەنایەوە! کەچیی، دوای سی دانە سالّی ڕەبەق، تازە سەرانی « پارتیی » و « یەکێتیی » دەیانەوێ، پاشەکشە لە « کەرکووک » بکەن!!!

جا، گەر « جـــــەلال تاڵەبانیی »، سکرتێری گشتیی « یەکێتیی » بێ، یا، « مەسعوود بارزانیی »، سەرۆکی « پارتیی » بێ، ئیدی ئەمە، ئەوە ناگەیەنێ، هیچ یەکێ لەو دووانە، سەرۆکی گەلی کوردی « باشووری کوردستان » بن! لەبەرئەوە، بە هیچ شێوەیە بۆیان نییە، واز لە یەک بست خاکی « کوردستان » بێنن و بە ناوی گەلی کوردەوە، هیچ جۆرە ڕێککەوتننامەیەک ئیمزاکەن!

دەبێ، هەموو کوردێکی دڵسۆز، ئەوە باش بزانێ، جگە لەوەی، هەموو سامانی زۆر زەویی « باشووری کوردستان »، لە پارێزگەی « کەرکووک »دا کۆبۆتەوە، بە تاکە ڕێی ڕزگاریی « کوردستان » و سەربەخۆیی کوردیش دادەنرێ! ڕاستە، گرفتێکی زۆر گەورە، لە سەر شاری « کەرکووک » هەیە، « عەرەب » و « توورک »، وەک دوو گوورگی برسیی، چـــاویان تێ بڕیوە. ڕاستە، خاکی « کـوردسـتـان »، لە دووڕگەیەکی داخراو دەچێ و بە زەریایەک گەلەگوورگ دەورەدراوە. بەلاّم، ئیدی نابێ، سەرکردەکانی کورد، هێندە نائومێد و ڕەشبین بن، دەسی خۆیەدەسەوەدان، بۆ داگیرکەرانی « کوردستان » بەرزکەنەوە! چونکە، بە دەیان هەلی مـێژوویی هەڵدەکەوێ، گـەر کـورد خـۆی شت بێ، یەکگرتوو و یەک ماڵ بێ، سەرکردایەتییەکی بلیمەت، هوشیار و ئازای هەبێ، هەلەکە لەکیس نەدا، زۆر بە ئاسانیی دەتوانێ، ئامانجە ڕەواکانی خۆی بەدیبێنێ. ئەدی گەر وا نەبێ، ئایا، کورد خۆی وەک نەتەوەیەکی چل میلیۆنی چییە و چی پێ دەکرێ؟ ئایا ناتوانێ، لە ڕێی کەناڵەکانی دیپلۆماسییەوە، چارەنووسی خـۆی و ئایندەی « کـوردســتـان » دیاریبکا؟!! بۆ نابێ، بەو شێوەیەی پێویستە و هەزاران ڕۆڵەی کورد، گیانی پاکی خۆیان، لەو ڕێگە پیرۆزەدا، بە دایکی نیشتمان بەخشیوە، کوردیش وەک هەموو نەتەوەکانی دیکەی جیهان، لە ماڵە کاولەکەی خۆیدا، وەک مرۆ بژی؟!!

لە کۆتاییشدا دەمەوێ، چەن خاڵێ، لە سەر پێتی گوتارەکەم دانێم، مەبەستی خۆم ڕوونترکەمەوە و بە کورتیی بپرسم:

ـ بۆ دەبێ، « تاڵەبانیی » هەر دەمـەی بە جـۆرێ، لە شـاری « کـەرکـووک » بدوێ، جارێ بە « قودس »ی « کوردستان »، دەمێ بە شاری « برایەتیی »، تاوێ بە « عێراقی بچکۆلە » و تاوێکی دیکەش، بە « برۆکسل »ی بچوێنێ؟!!

ئاخر، ئەو چەن چەمکانە، جیاوازییەکی زۆریان هەیە، بە تایبەتیی، هەر دوو شاری « کەرکووک » و « برۆکسل » هەر لە بەراوردکردن نایەن! سەیر ئەوەیە، عەرەبەکانی « عێراق »، هیچ یەکێ لەو چەمکانە پەسەند ناکەن، « کەرکووک »، هەر بە شارێکی « عێراقیی » دادەنێن! مەبەستیشیان تەنیا ئەوەیە، بە شارێکی « عەرەبیی » دەزانن! ئەگینا، تا « باشووری کوردستان »، بە دەوڵەتی « عێراق »ەوە گرێدرابێ، هەر سێ شارەکەی دیکەی « هەولێر، سولەیمانیی و دهۆک »یش، هەر بە سێ شاری « عێراق » دادەنرێن. کەچیی، دانیان بە « کوردستانێتیی »، ئەو سێ شارەدا ناوە و دان بە « کەرکووک »دا نانێن!

- بۆ دەبێ، « تاڵەبانیی » شاندێکی « توورک »، بۆ شاری « کەرکووک » داوەتکا، تا لە نزیکەوە، لە راستیی و دروستیی ڕووداوەکان بکۆڵنەوە؟ گریمان، پارێزگەی « کەرکووک »، سەر بە « باشووری کوردستان » نییە. بەڵام، ئایا « کەرکووک »، پارێزگەیەکی سەر بە « عێراق »، یا « توورکیا »یە، وا توورکەکان بە ئاشکرا، دەس لە کاری نێوخۆی شارەکە وەردەدەن؟!!

لە راستییدا، ئەو بڕیارە دەبێ، عەرەبەکان بیدەن، نەک « تاڵەبانیی »بیدا، کە لە ئاستی دیاریکردنی چارەنووسی کورد بە گشتیی و شاری « کەرکووک » بە تایبەتیی، دەسی لە کەروێشک کورتترە!

- تۆ بڵێی، کەمینە نەتەوەییەکانی « توورکمان، کلدان، ئەرمەن و ئاشوور »، لە « باشووری کوردستان » و لە نێو خۆیاندا، پیاوێکیان تێدا هەڵ نەکەوتبێ، داکۆکیی لە مافە ڕەواکانیان بکا؟!! تۆ بڵێی، خۆیان خاوەنی، چەندین پارتی جیاوازی ڕامیاریی نەبن، داوای مافە ڕەواکانی خۆیان بکەن؟!! جا گەر وایە، « تاڵەبانیی » و « بارزانیی »، بۆچی هەموو جارێ، بێ بۆنە و بە بۆنە، ناویاندێن و داکۆکییان لێ دەکەن؟!! ئایا لە « کوردستان »دا، هیچیان بە سەرهاتووە؟ کورد غەدری لێ کردوون و مافە « مرۆیی، نەتەوەیی، ڕامیاریی و دیمۆکراسیی »یەکانیان زەوتکراوە؟!! ئایا، مافی ئێمەش و ئەوانیش، هەر لای عەرەبە داگیرکەرەکانی « عێراق » نییە؟!! کەی کورد، هیچ جۆرە مافێکی ئەوانی پێشێلکردووە، تا « تاڵەبانیی » لە « تورکیا » بەڵێنبدا، شالیارگەیەک بۆ توورکمانەکانی « عێراق » دابینکا؟!! یا بۆ دەبێ، « بارزانیی » بڵێ: گەر یەک توورکمان لە « کوردستان » بمێنێ، من داکۆکیی لە مافە ڕەواکانیان دەکەم؟!!بە ڕاستیی، ئەمە ماڵوێرانیی و کارەسات نەبێ، هیچی دیکە نییە. ئاخر، کورد خۆی تا ئێستەش، جگە لەوەی هیچ نییە و دەسەڵاتی نییە، لە سەر کێشەی دەسەڵات و مافە نەتەوەییەکانی خۆشی، گەورەترین گرفتی،

لەگەڵ هەموو جیهاندا هەیە، تا، داکۆکیی لەو بێچووەگورگ و توولەمارانە بکا، کە وەک برا گەورە توورکەکانیان، زۆربەی هەرە زۆریان، هەر دانیش بە مافە ڕەواکانی کورد و ناوی « کوردستان »دا نانێن، بە مەرجێ، لە سەر خاکی « کوردستان »یش دەژین!
ـ بۆ دەبێ، « تاڵەبانیی » داوا لە توورکمانەکان بکا، لە هەڵبژاردنی ئایندەدا، پێکەوە دابەزن؟ ئەدی بۆچی، ئەو هاوکاریی و یەکگرتنە، لەگەڵ پارتێکی « کوردستانیی »دا ناکا؟!! دەبێ، جگە لەوەی دڵی « توورکیا »ی ئاغای ڕازیکا، لە هەڵبژاردنیشدا، گرێو لە « پارتیی » بەرێتەوە، چ جۆرە مەبەستێکی دیکەی هەبێ؟!!
ـ ئاخر بۆ دەبێ، « تاڵەبانیی » گوتاربدا و بڵێ: (ئەوەی هێرشی شەڕ بکاتە سەر « توورکیا »، مانای ئەوەیە، هێرش دەکاتە سەر گەلی کورد.)«4»
تۆ بڵێی، نەتەوەی توورک، هێندە بێ دەسەلاتبێ، پێویستی بە یارمەتیی « تاڵەبانیی » هەبێ و ئێمە نەمانزانیبێ؟!! یا، تۆ بڵێی، توورکەکانیش، بەشێ لە گرووپە ئێتنیکەکانی « باشووری کوردستان » پێکبێنن، وا « تاڵەبانیی » داکۆکییان لێ دەکا؟!! یا، تۆ بڵێی، گەلی کورد لە « باکووری کوردستان » بە گشتیی و گریلاکانی « P.K.K. » بە تایبەتیی، هەر وا بە خۆڕایی، گێچەڵ بە « تورکیا » بکەن؟!! ئاخر، ڕاستتر نەبوو، « تاڵەبانیی » بیگوتایە: ئەوەی دژی « تورکیا » بجەنگێ، دژی « یەکیتی نیشتمانیی » دەجەنگێ؟!! چونکە، نەک هەر ئەو بۆی نییە، بەڵکوو، هیچ سەرکردەیەکی دیکەی پارتێکی کوردیی و « کوردستانیی »ش بۆی نییە، نەک هەر بە ناوی هەموو کوردی پارچەکانی « کوردستان »ەوە قسەبکا و بڕیاربدا، بەڵکوو تەنانەت، بە ناوی گەلی کوردی « باشووری کوردستان »یشەوە بۆی نییە، بڕیاربدا! چونکە، سەردەمی دیکتاتۆری نیشتمانپەروەر و سەردەمی پارتی پێشڕەو بەسەرچوو، ئەو سەردەمە نەما، سەرۆکی پارت و سەرکردەی گەل. لە یەکدیدا بتوێنەوە، یەک واتا و چەمکی تێکهەڵکێشکراویان هەبێ، هەر وەک لە سەردەمی « مستەفا بارزانیی »دا باوبوو!
ـ سەیر ئەوەیە، « تاڵەبانیی »، ئەو هەموو ماستاوە، بۆ توورکمانەکان و سەرانی « توورکیا » ساردەکاتەوە، ئینجا، ئەوان باوەڕی پێ ناکەن! ئەوەتە، « بەرەی توورکمانیی »، بە ناوی « ڕێکخراوی نێو دەوڵەتیی داکۆکییکردن لە توورکمانەکانی عێراق »ەوە، بڵاڤۆکێکیان دەرکردووە و زۆر بە ڕاشکاویی داوایانکردووە: « بارزانیی » و « تاڵەبانیی »، بە تۆمەتی پێشێلکردنی مافەکانیان پێشەکەش بە دادگە بکرێن! «5»

هەروەدا، شالیاری دەرەوەی دەوڵەتی داگیرکەری « توورکیا ـ عەبدوڵڵا گوڵ »، لە وەڵامی ئەو لێبووردنەی « تاڵەبانیی »، بۆ ئەندامانی « **P.K.K.** » داوای کردبوو، گوتوویەتی: (ئەوە کاری « تاڵەبانیی » نییە!)«**6**»

ـ « بارزانیی »، هێندە باوەڕی بە « یاوەر » هەیە، لە کاتی سەردانەکەیدا بۆ هاوینەهەواری « سەلاحەدین »، زۆر بە ڕاشکاویی گوتی: گەلی کورد، پشتگیریی « یاوەر » دەکا! لە لایەکەوە، خۆ « بارزانیی » کوڕ، « بارزانیی » باوک نییە، تا سەرۆکی هەموو کورد بێ و بە ناوی گەلی کوردەوە بدوێ. بەڵکوو، تەنیا هەر، سەرۆکی پارتەکەی خۆی نەبێ، هیچی دیکە نییە!

لە لایەکی دیکەشەوە، بۆ دەبێ، کورد دەنگی خۆی بەو پیاوە بدا؟ ئایا، دید و بۆچوونی بەرانبەر بە شاری « کەرکووک »، گەڕانەوەی کوردە ئاوارەکان و دەرکردنی عەرەبە هاوردەکان چییە. را « بارزانیی »، زۆر بە کوڵوردڵەوە، هەر لە ئێستەوە، پڕوپاگەندەی بۆ دەکا و دەنگی هەموو گەلی کوردیشی بۆ دابیندەکا؟!! ئاخر، هەر ئەو پیاوە خێڵەکیی و شۆڤێنیستە نەبوو، ڕۆژی « 23 .06 .2004 »، کاتێ بۆ یەکەمین جار، سەردانی شاری « کەرکووک »ی کرد، لە وەڵامی پرسیارێکی کوردەکاندا، دەربارەی کوردە ئاوارە و عەرەبە هاوردەکان، دوورخستنەوەی خەڵکە نامۆکانی شاری « کەرکووک »، زۆر بە ڕاشکاویی گوتبووی: ( ڕێ نادەم، مامەڵە بەو جۆرە چەمکە ڕەقانە بکرێ، ئەوانە « عێراقیی »ن و ئەوەی دەیڵێی، قسەیەکی ڕەقە و ناشێ، پەسەندبکرێ. « عێراق »ی نوێ، کەس ناچار ناکا، شوێنی خۆی جێبێڵێ.)«**7**»

ئاخر دەبێ، ئەم قسە بێ ڕێ و جێیانەی سەرۆک کۆمار « یاوەر » کردوونی، بە ناوی ئازادیی و داکۆکییکردن لە مافی « عێراقیی »یەکانەوە، جگە لە قایلبوون بە بەعەرەبکردنی شاری « کەرکووک »، چ واتایەکی دیکەی شاراوەی هەبێ؟!! ئەرێ کوردینە هاوار! چی لە باسەکە گۆڕاوە؟!! « ئەمریکا » ئاوی بۆ کۆڕین یا بڵێی؟!!

* * *

**تێبینییەکان :**

* لە ئایندەیەکی نزیکدا، گوتارێکی درێژ، دەربارەی کەمینەی « توورکمان » بڵاودەکەمەوە.

# بە پێویستی دەزانم، بە دوای ئەم گوتارەدا، کورتەیەکی دوو گوتاری کۆنی خۆم بڵاوکەمەوە، کە پێوەندییەکی توندوتۆڵیان، بەم باسەوە هەیە. گوتاری یەکەم، تا ڕۆڵەکانی کورد بزانن، هەڵوێستی « ئەحمەد چەلەبی » و نوێنەرەکانی هەر دوو پارت، بەرانبەر شاری « کەرکووک » چۆن بووە!

گوتاری دووەمیشیان، لە سەردەمێکدا نووسراوە، هێشتا، دەوڵەتی « عێراق »، تووشی ئەو ئاژاوە و بەڵایەی ئەوڕۆی نەبووە، هێشتا، دەسەڵاتی خوێنڕێژانەی « سەددام » بەهێزبووە. لە لایەکی دیکەشەوە دەمەوێ، لە هەر دوو گوتارەکەدا، ئەوە دەرخەم، بە چ شێوەیە، هەم پێشبینیی داهاتووم کردووە و هەم چارەسەریشم بۆ گرفتەکە داناوە. بەڵام، بە داخەوە، لەوە دەچێ، نووسەرانی کورد، بۆ ڕۆڵەی نەتەوەیەک بنووسن، نەخوێننەوە!

**سەرچاوەکان :**

1. جلال الطالبانی، کردستان و الحرکه القومیه الکردیه، دار الطلیعه للطباعه و النشر، بیروت، 1969.
2. درکتۆر حوسێن محەمەد عەزیز، کورد و شۆڕش و هەلی مێژوویی، چاپ2، سولەیمانیی، 2000.
3. سۆکسە، دەربارەی کۆتاییهاتنی وتووێژی یەکێتی نیشتمانی و میری نیشتمانی، ستۆکهۆلم، 1985.
4. ڕۆژنامەی ئەمڕۆ، مانگی شەشی 2004، ...
5. ئەحمەد هیرانی، بەرەی تورکمانی و گلەییەک لە سەرانی کورد، سایتی Kurdistanpost، 2004. 07. 07.
6. سایتی www.kdp.se ڕۆژی « 2004. 06. 25 ».
7. محیط. الباور یعارض ای تغیر للوضع الاثنی فی مدینه کرکوک النفطیه. (لن لسمح بان تتعامل بمثل هذه العبارات القاسیه. فهؤلاء عراقیون و ما تتحدث به کلام قاس، لا یمکن قبوله. العراق الجدید لن یجبر احدا علی ترک موقعه.)

# بۆرە نەبێ، بازە بێ،
# کلک بە ئەندازە بێ!

## ڕوونکردنەوەیەکی پێویست:

باوەڕ ناکەم، پێش ئەوەی، ڕژێمی «بەعس» بڕوخێ، سەرکردەی هێزەکانی ئۆپۆزیسیۆنی «عێراق»، بە هیچ شێوەیە، دانیان بە «کوردستانێتیی» شاری «کەرکووک»دا نابێ. بەڵام، تەنیا هێندە هەیە، سەرانی کورد، ئەو کێشە گرنگەیان، پشتگوێخستبوو، چونکە، هەموو ئامانجێکیان، تەنیا هەر ئەوەبوو، ڕژێمی «بەعس» نەمێنێ! جا دوایی، لەگەڵ ئەو هێزانەدا، لە سەر کێشەی «کەرکووک»، تووشی چ جۆرە گرفتێ دەبن، بە لایانەوە گرنگ نەبووە!
ئاخر، بۆچی خۆمان بخەڵەتێنین، خۆ تەنیا هەر ئێستە، سەرانی ئەو دوو زلهێزە، قرقەپیان، لە هێندێ لە مافەکانی گەلەکەی خۆیان نەکردووە، لە بەردەم سەرانی داگیرکەری عەرەبدا، بێ دەنگ نەبوون، بەڵکوو، هەر لە کۆنەوە، ئەوە پیشەیان بووە! بۆ نموونە:
ڕۆژی «25. 10. 1997»، سەرۆکی «INC ـ کۆنگرەی نیشتمانیی عێراق»، دوکتۆر «ئەحمەد چەلەبیی»، لە شاری «ستۆکهۆڵم»، دەربارەی مێژووی دامەزراندن، چالاکیی، ڕەوشی «INC» و باری ڕامیاریی «عێراق» سیمینارێکی گرت. لە قسەکانیدا، بە هیچ شێوەیە، باسی «کوردستانێتیی» شاری «کەرکووک»ی نەکرد.
جا، گەر ئەو کاتە، «چەلەبیی»، هێشتا هیچ دەسەڵاتێکی نەبووبێ، تەنیا هەر، وەک سیخوڕێکی «ئەمێریکا»، بە شارەکانی «ئەورووپا» و «ئەمێریکا»دا خولابێتەوە، تا، خەڵک لە دەوری خۆی کۆکاتەوە، مافێکی ئەوتۆی، بە گەلی کورد ڕەوا نەبینیبێ، ئێستە چۆن، دان بە هێندێ خاڵی گرنگی وەک: «مافی چارەنووسی کورد، کوردستانێتیی کەرکووک ...»دا دەنێ؟!! ئەگینا، مەگەر هەر سەرانی «پارتیی» و «یەکێتیی»، دەهۆڵیان بۆ کوتابێ و بە دزیی گەلی کوردیان دانابێ، وەک ئێستەش چۆن، دەهۆڵ بۆ «یارەر» دەکوتن!!!

ئاخر، جگە لە چەن کوردێکی بێلایەن، هۆڵەکە بە ئەندامانی هەر دوو پارت سیخناخکرابوو، ئینجا، دەنگ لە بەردەوە هاتبێ، دەنگ لە یەک ئەندامی گچکە و گەورە، بەرز و نزم، پێشکەوتوو و دواکەوتوو، سەرکردایەتی و خوار سەرکردایەتی، ئەو دوو پارتەوە نەهات!
جا، پارتێ ئەندامەکانی خۆی، بەو شێوەیە پەروەردەکردبێ، لە بەردەم دوژمنی داگیرکەردا، داکۆکیی لە مافە ڕەواکانی کورد نەکەن، لە بەردەم سەرانی داگیرکەراندا ئەوێرن، دەم هەڵبێننەوە، ئیدی دەبێ، گلەیی چیان لێ بکەین؟!!
با ئێستەش، چاوێ بەو گوتارەدا بخشێنین، کە پێش «7» دانە ساڵ، بەو بۆنەیەوە نووسیمە و لە گۆڤاری «هەربانگ»ی ژمارە «109» سالی «1998»دا بڵاوکراوەتەوە، تا بزانین، ئەو دوو پارتە، هەر لە کۆنەوە، بە چ شێوەیە، هەڵسوکەتیان، لەگەڵ کێشە گرنگ و چارەنووسازەکانی کورددا کردووە؟!!
«بۆرە» و «بازە» هەر دووکیان، هەر ناوی دوو سەگن. بەڵام، کامیان لە کامیان، کلکی درێژتر و لە سەر شانە، ئەوەیان گرنگە. چونکە، لە کۆمەڵی کوردەواریی کۆندا، ئەو سەگەی کلکی لە سەر شان بووایە، بە ڕاست و بە چەپ، وەک باوەشێن ڕایوەشاندایە، ئەوە، بە سەگێکی باش و زۆر پەسەند دادەنرا!
منیش، لە بەر ڕۆشنایی ئەو پەندە کوردییە ڕەسەنەدا، «سەددام حوسێن»م بە ناوی یەکەم و «ئەحمەد چەلەبیی»شم، بە ناوی دووەم سەگەوە ناونابوو. مەبەستیشم ئەوەبووە، هەر دووکیان هەر داگیرکەرن، بەڵام، کامیان پتر بۆ کورد باشترە و دان بە مافە ڕەواکانیدا دەنێ، ئەوەیان لای من بایەخی پتر هەیە. ئەگینا، گەر هەر دووکیان وەک یەک، دژایەتی کورد بکەن، وەک یەک، ڕۆڵەکانی کورد سەربڕن، ئیدی، جیاوازییان بۆ منی کورد چییە، گەر یەکێکیان سەرۆک کۆمار و ئەوی دیکەشیان دەرۆزەکار بێ؟!!

## کورتەی دەقی گوتارەکە

ئەز، هێندەی لە قسەکانی «چەلەبیی» تێگەیشتم، پیاوێکی زیرەک و بە توانا بوو، شارەزاییەکی تەواویی، لە باری ئەوڕۆی پۆلیتیکی «عێراق، نێوچەکە و جیهان»یشدا هەبوو. بەڵام، دەربارەی کێشەی نەتەوەیی، چارەسەرکردنی گرفتەکانی گەلانی بندەس و مافی چارەنووسی نەتەوەکان، تا بڵێی، لە هۆش و بیردا پێخاوسبوو! جا نازانم، ئەو کاڵفامیی و نەزانییەی لەوەوە هاتبوو، وەک هەموو شۆڤێنیستێکی بەرچاوتەنگی نەتەوەی سەردەس، لە ئاستی کێشەی کورددا، خۆی کەڕ و کوێر کردبوو، یا هەر دەیویست، خۆی وا پیشان

دا، پیارێکی دیمۆکراسیی لیبرالّی سەربەخۆیە و بڕوای بەوە هەیە، چەن گەلێکی دیاریکراو، لە چوارچێوەی دەولّەتێکی پەرلەمانیی لیبرالّدا، پێکەوە بژین؟!!
بە هەر شێوەیەبێ، هیچ لە باسەکەمان ناگۆڕێ. چونکە، دوکتۆر بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، نە دانی بە بوونی گەلی کورد لە « باشووری کوردستان »دا دەنا، نە بڕواشی بە خاکێکی جیاواز هەبوو، ناوی « کوردستان » بێ و نە هیچ مافێکیشی پێ ڕەوادەبینی. با لێرەدا، چەن نموونەیەک، لە سەر دید و بۆچوونەکانی، فەیلەسوف و پێشـــــەوای دوارۆژی هێزەکانی ئۆپۆزیسیۆنی « عێراق » بێنمەوە.
دوکتۆر، هەر لە سەرەتاوە، وەک بەڕوو لە دەمیدا تەقیبێتەوە، بە گرفتەکانی گەلی « عێراق » و « باکووری عێراق » دەستپێکرد. کەم جار هەبوو، زمانی تەتەڵەبکا و ناوی « کوردستانی عێراق »، لە دەمی دەرچێ. مەگەر، لە بەر دلّی برا کوردەکەی تەنیشتی، دوکتۆر « لەتیف رەشید »، ئەندامی ســـەرکردایەتی « یەکێتی نیشتمانیی کوردستان » و جێگری سەرۆکی « INC » بووبێ، چەن جارێ، ووشەی « کوردستان »ی بە دەمدا هاتبێ! ئەگینا، زۆربەی جـار، هەر « باکووری عێراق »ی بەکاردەهێنا. بە کورتیی دەتوانم، دید و بۆچوونەکانی دوکتۆر، لە چەن ڕستەیەکدا چڕکەمەوە:
ئەوەی لای ئەو گرنگبوو، بەرژەوەندیی خۆی، « INC » و گەلی « عێراق » بوو، ئەویش، خۆی لە ڕووخاندنی ڕژێم و دامەزراندنی دەولّەتێکی دیمۆکراسییدا دەنواند. لە باسی مافەکانی گەلی کورددا، باسی مافی چارەنووسی کرد، بە مەرجێ ئەو مافە، لە چوارچێوەی سنووری « عێراق » دەر نەچێ، ڕێز لە یەکێتی خاکەکەی بگیرێ و پارێزگاریی یەکێتی خاکی « عێراق » بکرێ. بە تەواویی تێ نەگەیشتم، ئەو « فیدرالّیی »ەی، بە گەلی کوردی « باشووری کوردستان »ی ڕەوا دەبینی، ڕەنگ و ڕووی چۆن بوو!
لە وەلاّمی چەن پرسیارێکدا، دەربارەی نێوچەکانی « کەرکووک، خانەقین، زەنگار ... تاد »، زۆر بە ڕاشکاویی گوتی: هەرچەندە، زۆربەی دانیشتووانی ئەو نێوچانە، لە کورد پێکهاتوون، بەلاّم، من ناتوانم، بلّێم: ئەو نێوچانە، بەشێ لە « کوردستان » پێکدێنن. بەلّکوو، بەشێکن لە « عێراق ». بەلّگەشی ئەوەبوو، گوایە، لەو نێوچانەدا، هەر کوردی تێدا ناژی، بەلّکوو « عەرەب، توورکمان، کلدان، ئەرمەن و ئاشووریی »شی تێدا دەژی. هـــەروەها گوتی: لە « بەغدا »ش، نزیکەی یەک میلیۆن کورد هەیە، لەبەرئەوە ناتوانین، شـــاری « بەغدا »ش، بە شارێکی عەرەبیی دانێین، بەلّکوو، شارێکی « عێراق »ە!

پاشان، چەن نموونەیەکی لە سەر « رووسیا » و « ئەمێریکا » هێنایەوە، کە لە ڕاستیدا، فرێ بە سەر باسەکەوە نەبوو، بەڵکوو پتر، بۆ خۆقوتارکردنبوو. دوکتۆر، بە هیچ شێوەیە، جیاوازیی لە نێوان گەلانی « عێراق »دا نەدەکرد. لەبری ئەوەی، زاراوەی گەلانی « عێراق » بەکاربێنێ، تەنیا هەر، زاراوەی گەلی « عێراق »ی بەکاردەهێنا!
بەپێی زانستی جوگرافیای ڕامیاریی، فاکتەرەکانی هێزی دەوڵەت و بنەما سەرەکییەکانی جیۆپۆلێتیک، بەکارهێنانی زاراوەی گەلی « عێراق »، لە جێی خۆیدا نییە. چونکە، « عێراق » دەوڵەتێکی ناسیۆنال نییە. واتە: هەموو دانیشتووانی « عێراق »، لە یەک گەلی هاودەنگ و هاوڕەنگ پێک نەهاتووە. بەڵکوو، دەوڵەتێکی تێریتۆریاڵە. واتە: لە چەن کەمینەیەکی نەتەوەیی، گەل و نیشتمانێکی جیاواز پێکهاتووە. تەنانەت « عەبدولکەریم قاسم »یش، ڕۆژی « 27. 07. 1958 »، واتە: تەنیا سیازدە ڕۆژ، بە سەر کۆدەتاکەیدا تێپەڕبوو بوو، ئەم ڕاستییەی ڕاگەیاند و لە دەستووری ئەو کاتەی « عێراق »دا نووسی: (عێراق نیشتمانی هاوبەشی عەرەب و کوردە)«17،1»
ئاشکرایە، ئیمپریالیزمی « بریتانیا »، ساڵی « 1923 »، دەوڵەتی « عێراق »ی دروستکرد. « خوارووی کوردستان »ی، بە زۆر، بە « عێراق »ەوە لکاند، کە تا ئەوڕۆش، ئەو پێکەوەلکاندنە هەر بەردەوامە! جگە لەوەش، ناکۆکیی و پشێویش، لە نێوان گەلانی « عێراق »دا لە ئارادایە. تەنانەت شا « فەیسەڵ »، پتر لە شەست ساڵ لەمەوبەر، لە یاداشتە نهێنییەکانی خۆیدا نووسیوێتی:
(تا ئێستە، شتێ نییە، ناوی گەلی « عێراق » بێ. کە ئەمە دەڵێم، بەژارە دڵم دەجنێ. ئەوەی هەیە، جەماوەری زۆری خەڵکانێکە، مرۆڤ ناتوانێ، وەبەر زەینی خۆی بدا. دڵیان لە هەستی نیشتمانیی خاڵییە، بەڵام، سنگیان لە نەریتی ئایینیی و هیچوپووچ پڕە، هیچ پێوەندییەک پێکیانەوە نابەستێ. کوێرایەڵی لایەنی شەڕن و بەرەو ئاژاوە ملدەنێن، لە هەموو میرییەک وەڕسن، هەر چی چۆنێبێ. ئێمە گەرەکمانە، لەم جەماوەرە، « گەل »ێک پێکبێنین، ڕایبێنین، فێریکەین و خاوێنیکەینەوە. بارەکە وابێ، ئەو هەوڵەی دەبێ، بۆ بەدیهێنانی ئەو ئامانجە بدرێ، ناشێ بشێ، بە بیری کەسدا بێ.)
«252،3»
لەبەرئەوە، لە ڕووی زانست و لۆژیکەوە، « عێراق » دەوڵەتێکی فرە نەتەوە و نیشتمانە، لە دوو گەلی سەرەکیی عەرەب و کورد، چەن کەمینە نەتەوەییەکی وەک: « توورکمان، کلدان، ئەرمەن و ئاشووریی » پێکهاتووە. لە ڕووی جوگرافیاوە، لە دوو نیشتمانی جیاوازی وەک « عەرەبستان » و « باشووری

کوردستان » درووستبووه. له دوای یەکەمین جەنگی جیهان، ئیمپریالیزم، ئەم دوو گەل و دوو نیشتمانە جیاوازەی، لە نەتەوە و نیشتمانە گەورە ڕەسەنەکەی خۆیان دابڕی. بۆیە، هەر وەک چۆن، گەلی عەرەب لە « عێراق »دا، بە بەشێ لە نەتەوەی عەرەب و « عەرەبستان »یش، بە پارچەیە لە نیشتمانە پانوپۆڕەکەی عەرەب دادەنرێ، بە هەمان شێوەش، گەلی کورد لە « عێراق »دا، بە بەشێ لە نەتەوەی کورد و « باشوور »یش، بە پارچەیە لە « کوردستان »ی نیشتمانی کورد دادەنرێ. ئەمە وەک ڕاستیییەکی مێژوویی و جوگرافیایی، هیچ جۆرە دەمەتەقێ و گۆڕانکارییەک هەڵ ناگرێ، مەگەر چەن شۆڤێنیستێکی عەرەبی وەک ناغای « چەلەبی » و « سەددام »، بەو ڕاستیی و لۆژیکە قەڵسبن و ڕەتیکەنەوە، « عێراق » وەک دەوڵەتێ، بە عەرەب، کورد و هەموو کەمینە نەتەوەییەکانییەوە، بە بەشێ لە نیشتمانی عەرەب دانێن!

بۆیە، هەرگیز شتێ نەبووە، نییە و ناشبێ، ناوی گەلی « عێراق » بێ! لەبەرئەوە دەبێ، لە خۆمانەوە دەسپێبکەین و لەبری زاراوەی گەلی « عێراق »، زاراوەی گەلانی « عێراق » بەکاربێنین.

زاراوەی گەلی « عێراق، ئێران، توورکیا، یۆگۆسلاڤیا، ئەسیوبیا، سۆڤێت ... تاد »، لە بنەڕەتدا، دوو لایەنی دژ بە یەکی، وەک ئیمپریالیزمی « ئینگلیزی » و « کۆمۆنیست »ەکان، لە پێناوی بەرژەوەندییە تایبەتیییەکانی خۆیاندا دایانڕشتووە. تا، ئەو گەلانەی لە بن دەسیاندا بوون، لە چوارچێوەی دەوڵەتێکی فرە نەتەوە و نیشتماندا کۆیانکەنەوە. بۆ نموونە:

« یەکێتی سۆڤێت »، پتر لە سەد نەتەوە، گەل و کەمینەی نەتەوەیی تێدا دەژیا، کەچیی، هەر دەیانگوت: گەلی « سۆڤێت » و بە گەلانی « سۆڤێت » ناویان نەدەبردن. هەر لە سەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی « عێراق »یشەوە، کاربەدەسانی « ئینگلیز »، ئەم زاراوەیەیان داناوە و تا ئەوڕۆش، هەر بە هەڵە بەکاردێنرێ. ئێستە، کاتی ئەوە هاتووە، ئەو هەڵەیە ڕاستکرێتەوە. چونکە، گەر هەر کەسێ، باوەڕ بەوە نەکا، « عێراق » لە چەن گەل و کەمینەیەکی نەتەوەیی جیاواز پێکهاتووە، واتای ئەوەیە، دان بە مافە نەتەوەیییەکانی گەل و کەمینەکاندا نانێ، هەمووشیان، تەنیا هەر بە عەرەب دادەنێ!

کەچیی، دوکتۆر لەبەرئەوەی تا ئێستە، کەس ئەم ڕاستیییانەی بە گوێدا نەدا بوو، گوتی: ئەم قسانە هی نەتەوەیییەکانە، گەلی « عێراق »، هەر یەک گەلە و جیاوازیی لە نێوانیاندا نییە. جگە لەوەی، بە ئاشکراش خۆی هەڵدەخەڵەتاند و نەیدەزانی، بیروباوەڕە شۆڤێنیییەکانی خۆی، چۆن لێفەپۆشکا! لە هەمان کاتیشدا دەیویست، بە زانیارییە ناڕاستەکانی، گوێی بەشدارانی کۆڕەکە

بناخنێ و باوەڕیان پێ بێنێ! تەنانەت، چەن نموونەیەکی لە سەر هەر دوو گەلی « ڕووس » و « ئەمریکا » هێنایەوە، بە هیچ جۆرێ، لەگەڵ وەڵامی پرسیارەکان و مەبەستە سەرەکییەکەی خۆشیدا نەدەگونجا!
بەڵام بە داخەوە، لە کاتێکدا ئاغای « چەلەبیی »، ئەم مرواریی و گەوهەرانەی هەڵدەڕشت، میکرۆفۆنەکە، بە دەس خۆیەوە بوو، بە ئارەزووی دڵی خۆی، زانیاریی ناڕاستی بڵاودەکردەوە، لەوە پتر ڕێگەیان نەدەدا، وەڵامبدرێتەوە و ڕاستییەکان بۆ ئەویش و بەشدارانی کۆڕەکەش ڕوونکرێتەوە. ئەگینا، ئەو کەسەی کەمێ شارەزایی، لە کێشەی نەتەوەیی و پێکهاتەی دەوڵەتەکانی جیهاندا هەبێ، بە ئاسانیی دەزانێ، « ڕووسیای فیدراڵ »ی ئەمڕۆ، دەوڵەتێکی ناسیۆنال نییە، بەڵکوو، لە چەن گەل و کەمینەیەکی نەتەوەیی پێکهاتووە، هێندێکیان « فیدراڵیی » و هێندێکی دیکەشیان « ئۆتۆنۆمیی »یان هەیە. کە دەشگوترێ گەلی « ڕووس »، تەنیا مەبەست لە گەلی « ڕووس » خۆیەتی، نەک هەموو ئەو گەلانەی، لە چوارچێوەی دەوڵەتی « ڕووسیای فیدراڵ »دا دەژین. چونکە، کەس نالێ گەلی « ڕووسیا »، بەڵکوو دەڵێن، گەل یا نەتەوەی « ڕووس »، لەبەرئەوەی « ڕووسیا »، ناوی خاک و دەوڵەتەکەیە و « ڕووس »یش ناوی نەتەوەکەیە.
گەلی « ئەمریکا »ش، هەر کەسێ دەربارەی دۆزینەوە و ئاوەدانکردنەوەی کیشوەری « ئەمریکا »، کەمێ زانیاریی هەبێ، هەرگیز ئەو وڕێنانە ناکا. چونکە خاکی « ئەمریکا »، جگە لەوەی، لە سەردەمێکی کۆنەوە، نیشتمانی ڕەسەن و دێرینی « هیندیی »یە « سوور »ەکان بووە، لە لایەن چەندین گەلی « ئەورووپایی، ئاسیایی و ئەفریکایی »شەوە ئاوەدانکراوەتەوە. واتە: وڵاتی پەنابەرانی گەلانی جیهانی جیاوازە و هەر یەکەیان، لە سەردەمێکی مێژوویی دیاریکراودا، کۆچیانکردووە و لەوێ نیشتەجێبوون. هەر گەلەشی، زمانی تایبەتیی خۆی هەبووە و تا ئەوڕۆش، هێندێکیان هەر پاراستوویانە. بەڵام، لە ئەنجامی پێکەوە ژیانی هاوبەشی پتر لە دوو سەدە، پێداویستییەکانی ژیان و ئەو سیستێمە دیمۆکراسییەی، هەر لە کۆنەوە، لە « ئەمریکا » پێڕەوکراوە، هەر لە سەرەتای ڕۆژەکانی داگیرکردنی « ئەمریکا »وە، لە لایەن « بریتانیا »ی گەورەوە، زمانی ئینگلیزیی، وەک زمانی دەوڵەت و زمانی هاوبەش، بە سەر هەموو ئەو گەلە کۆچکردووانەدا خۆی سەپاندووە.
بۆیە، گەلی « ئەمریکا »، بارودۆخێکی تایبەتیی هەیە و گەلێکی هاوئاهەنگ نییە. (دەوڵەتە « ئەمریکایی »یەکان، لە باروودۆخێکی جوگرافیایی، مێژوویی، کۆمەلایەتیی تایبەتیی و بەدەگمەنی وادا درووستبوون ... زۆربەی زۆری

ـ انیشنووانی، له کۆچبەران پێکهاتوون. له وڵاته جیاوازەکانی جیهانەوه چوونەته ئەوێ و لەگەڵ خۆیاندا، زمان، دابونەریت و خەسڵەته نەتەوەییەکانی خۆیان گواستۆتەوه. لەبەرئەوه، وڵاتەکانی « ئەمەریکا »، وەک بۆتەیەکی لێهاتووه، گەله جیاوازەکان، به ڕێژه و چۆنێتی جیاواز، تێکەڵاو و ئاوێتەی یەکدی بوون و تواونەتەوه.)«66،5».
جا وا دیاره، ئاغای « چەلەبی » ش دەیویست، گەلی کورد و کەمینه نەتەوەییەکانی دیکەی « باشووری کوردستان »یش، له ژێر نــــــاوی گەلی « عێراق » و له بۆتەی گەلی عەرەبدا بتوێنێتەوه!!! لەوه دەچێ، جیاوازیی له نێوان گەله کۆچکردووەکانی « ئەمەریکا » و گەلی کوردا نەکا، کە ئەو گەلانەی « ئەمەریکا »، خاکی خۆیان نەبووه و کۆچکردووبوون. بەڵام، ئەوەتەی نەتەوەی کورد هەیه، له « کوردستان »ەکەی خۆیدا دەژی؟!! یا، وا دیاره، ئەمیش وەک « بەعسیی »یه « عەفلەقیی »یه شۆڤێنییەکان، کورد به کەمه نەتەوەیی و میوان، خاکی « کوردستان »یش، به پارچەیه له نیشتمانی عەرەب دەزانێ! بۆیه پێویسته، له بۆتەی نەتەوەی عەرەبدا بتوێنەوه. چونکه، له خاڵی « 11 »ی دەستووری پارتی « بەعس »دا، دەربارەی کەمینه نەتەوەییەکان و گەلی کورد نووسراوه:(ئەوەی باسی کۆمەڵه ڕەگەزێکی دیکەی جیاواز بکا، یا، دژی عەرەب کاری تێدا بکا، یا، بۆ مەبەستێکی داگیرکەرانه هاتبێته نیشتمانی عەرەب، له وڵاتی عەرەب بەدەردەنرێ.)«8،4».
دەربارەی کێشەی « کەرکووک » و نێوچەکانی دیکەی « کوردستان »یش، گەر ئەوڕۆ، پیاوێکی وەک « چەلەبی »، بەو هەموو بێ دەسەڵاتییەی خۆیـــــەوه، « کەرکووک » به « کوردستان » نەزانێ، ئایا، له پاشەڕۆژدا دەتوانێ، به شێوەیەکی ئاشتییانه و دێمۆکراسییانه، ئەو کێشه گەورەیه چارەسەرکا؟*
ڕاسته، تا کورد له چوارچێوەی کۆماری « عێراق »دا بژی، « کەرکووک »، هەر وەک شارێکی « عێراق » تەماشادەکرێ. بەڵام پێویسته، سنووره جوگرافیایی و ڕوخساره نەتەوەییەکەی، هەر له ئێستەوه دیاریبکرێ. چونکه، یەکێ له پرینسیپه هەره گرنگەکانی سیستێمی « ئۆتۆنۆمیی ـ فیدراڵیی » ئەوەیه، دەبێ، جوگرافیای هەرێمه جیاوازەکان و سنووری ڕامیاریی، هەر نێوچەیەکی « ئۆتۆنۆمیی »، یا هەرێمێکی « فیدراڵیی » دەستنیشانکرێ. ڕاسته، له پارێزگەی « کەرکووک »، جگه له کورد، هێندێ کەمینەی نەتەوەیـــــی وەک « عەرەب، توورکمان، کلدان، ئەرمەن و ئاشووریی »شی لێ دەژین، بەڵام، ئەمه ئەوه ناگەیەنێ، ئیدی ناسنامەی نەتەوەیی پارێزگەی « کەرکووک »، هێنده ئاڵۆز و قورسبێ، به هیچ شێوەیه دیاریی نەکرێ!

بەڵێ ڕاستە، وەک هەموو شارێکی دیکەی ئەم جیهانە، چەن کەمینەیەکی نەتەوەیی، لە شاری « کەرکووک »یش دەژین. بەڵام، هەر وەک چۆن، هەر دوو شاری « مەککە » و « مەدینە »، بە دوو شاری « عەرەبستانی سعوودیە » دادەنرێن، هەموو بەڵگە و ڕاستییە مێژوویی و جوگرافیاییەکانیش، ئەوە دەسەلمێنن: « کەرکووک »یش شارێکی « کوردستان »ە.

هەروەها، جگە لەو عەرەبانەی، لە دوای یەکەمین جەنگی جیهان، لە سنووری پارێزگەی « کەرکووک »دا نیشتەجێکراون، « باشووری کوردستان » بە نیشتمانی، هەموو ئەو کەمینە نەتەوەییانەش دادەنرێ، کە لە مێژوویەکی کۆنەوە، تێیدا ژیاون و ئێستەش تێیدا دەژین. کەواتە: هەر وەک چۆن، گەلی کورد لە « باشوور »دا، بە بەشێ لە گەلی « عێراق » دانانرێ، هەروەها، ئەوانیش بەشێ لە گەلی « عێراق » پێک ناهێنن. وەک ئاغای « چەلەبی » دەیەوێ، ڕاستییەکان چەواشەکا!

دوکتۆر، لەبەرئەوەی، دان بە « کوردستانێتی » شاری « کەرکووک » و ناوچەکانی دیکەی « باشوور »دا نانێ، خۆی دەخەڵەتاند، خەریکبوو، چارەنووسی شارێکی وەک « بەغدا »شی، دەخستە مەترسییەوە. ئاخر، گەر بەو شێوەیە، چارەسەری گرفتەکانی گەلانی « عێراق » و دەوڵەتی پاشەڕۆژی « عێراق » بکا، دیارە، سەرۆک و سەرکردەیەکی زۆر دڵسۆز، کارامە و بەرچاو ڕوونە، مانگە شەویش، هەر سەر لە ئێوارە دیارە!

بە لای منەوە، دوژمنی ئاشکرا، گەلێ لە دوژمنی شاراوە باشترە و مەترسیی کەمترە. چونکە، دوژمنێ بە ناوی دۆستایەتی گەلی کوردەوە، لە ڕیزەکانی گەلدا خۆی حەشاردا، مەترسیی لە دوژمنێکی ئاشکرا گەلێ زیاترە. بۆ نموونە: « سەددام »، بە ئاشکرا دژایەتیماندەکا، دەمانکوژێ، ڕاماندەگوێزێ، ئەنفالماندەکا، کیمیاباران و ژاربارانماندەکا، « کەرکووک » و هەموو ناوچەکانی دیکەی « باشوور »، بە خاکی عەرەب دادەنێ. بەڵام، وەک دەڵێن: ئاغای « چەلەبی »، گوورگە و لە پێستی مەڕدا، خۆی حەشارداوە! جا ئەوە ئەورۆ، تەنیا لە سەر پارەوپوولی « ئەمێریکا » و « بریتانیا »ی ئاغای دەلەوەڕێ، نە لە « عێراق » و نە لە « کوردستان »، خاوەنی هیچ جۆرە دەسەڵاتێکی « ڕامیاریی، سەربازیی و ئابووریی » نییە، قسەی تا بەر لووتی خۆی پتر بڕناکا، کەچیی، خاوەنی ئەو بیرە پووچ و دیدە گەندەڵانەیە، بەو شێوەیە دەدوێ و دەیەوێ، بە فشەمافێ هەڵمانخەڵەتێنێ. ئەدی خوا نەخواستە، گەر سبەینێ، دەسەڵات پەیداکا و تەنیا هەر خۆی، بکوژ و ببڕبێ، دەبێ، لە ژێر چارشێوی دیمۆکراسیی و دەوڵەتی لیبراڵدا، چی بە سەر گەلی

کورد بێنێ؟ تۆ بڵێی، ئەم جارەشیان سەد رەحمەت، بۆ کەڵەندی پێشوو بنێرین؟!! من وەک کوردێ، بە لامەوە گرنگ نییە، کێ لە « بەغدا » فرمانڕەواییدەکا، بەڵام، ئەوەی بە لای منەوە گرنگە، پێویستە ئەو کەسە، دان بە هەموو مافە نەتەوەییە رەواکانی، گەلی کوردا بنێ، وەک دەڵێن: « با بڕە نەبڕێ، بازە بێ، بەڵام، کلکی بە ئەندازە بێ !»

ئەز، گلەیی لە دوکتۆر ناکەم. بەڵام، رەخنەیەکی گەورە، ئاراستەی سەرانی کورد دەکەم. چونکە، پێش ئەوەی، لە سەر مافە ستراتیژییەکانی گەلی کورد، لەگەڵ ئەو پیاوەدا رێککەون، دەبووایە، هەموو ئەو پارتە « کوردستانیی »یانەی بەشداریییان لە « INC »دا کردووە، هەر لە سەرەتاوە، هەموو شتێکیان لەگەڵدا یەکلاییکردایەتەوە، نەک هەموو کێشە گرنگ و ستراتیژییەکان، بۆ پاشەڕۆژێکی نادیار هەڵگرن. وا دیارە، ئەو کۆر و کۆمەڵە رامیارییانەی کورد، پەنیان لە رێککەوتننامەی « 11/مارس/1970 » وەر نەگرتووە و هەرگیزاوهەرگیزیش، کەڵک لە مێژوو وەرناگرن! لەوە دەچێ، کاغەزی سپییان بۆ واژووکردبێ، بە سەرۆکی خۆیان و هەموو گەلانی « عێراق »یشیان دانابێ. بۆیە، ئەویش وا بە ئاشکرا، ئەو هەموو بیروباوەڕە شۆڤێنیستانەیەی، بە سەر گوێگراندا هەڵدەڕشت، یەکێ لە نوێنەرەکانی « یەکێتیی » و « پارتیی »ش، وەڵامێکیان نەدایەوە! تەنانەت، دوکتۆر « لەتیف رەشید »، لە تەنیشتییەوە دانیشتبوو، لەو بارەیەوە دەنگ لە بەردەوە هاتبێ، دەنگ لەو پیاوەوە نەهاتووە! بە داخەوە، نوێنەرانی هەر دوو زلهێزە « کوردستان »ویرانکەرەکە، لە ناو یەکدی سڕینەوە، لە بەر هەڵپەی پارە و دەسەڵات، کێشە ستراتیژیی و مافەکانی گەلی کوردیان لە بیرکردووە. لە بری ئەوەی، داکۆکیی لە مافەکانی گەلی کورد بکەن، جلە کۆنە چڵکنەکانی خۆیان، بە تەنافی بریقەداری ئاغای « چەلەبیی »دا هەڵدەواسی و تەنیا، لەو بوارانەدا قسەیاندەکرد، کە پێوەندیی بە رێکخراوەکانی خۆیانەوە هەبوو، وەک ئەوەی، کێشەی کورد، تەنیا لە رێکخراوەکەی خۆیاندا ببینن، شتێ نەبێ، ناوی گەلی کورد بێ، بەڵکوو، لە « کوردستان »، دوو گەلی جیاوازی « پارتیی » و « یەکێتیی » هەبێ!

پێویستە، سەرانی « پارتیی » و « یەکێتیی » بە تایبەتیی، گەلی عەرەبی « عێراق » و گشت گەلانی دیکەی جیهان بە گشتیی، ئەو راستییە باش بزانن، کێشەی کورد، هەر وا کێشەیەکی لاوەکیی زادەی بیری چەن سەرکردە و چەن رێکخراوێکی رامیاریی « کوردستان » و « عێراق » نییە، بە ئارەزووی چەن کەسێ درووستبووبێ، بەڵکوو، کێشەی نەتەوەیەکی پتر لە چل میلیۆن مرۆڤە، کێشەی نەتەوەیەکی داگیرکراو و دابەشکراوە، لە هەموو جۆرە

مافێکی نەتەوەیی و دیمۆکراسیی بۆ بەشکراوە، کێشەیەکی نەتەوەیی و رامیارییە، پێویستی بە چارەسەرێکی بنەڕەتیی ئاشتییانە و دیمۆکراسییانە هەیە، تەنیا خۆشی لەوەدا دەبینێ، هەموو لایەنە پێوەندیدارەکان بێ جیاوازیی، دان بە مافی چارەنووسی نەتەوەی کورد، سەربەخۆیی رامیاریی، ئابووریی تەواوی « کوردستان » و دامەزراندنی دەوڵەتێکی یەکگرتووی « کوردستانیی »دا بنێن. هەموو مرۆڤێکی بە ویژدان، پێشکەتووخواز و دڵسۆز، بۆ نەتەوە و نیشتمانەکەی خۆی، پێویستە، دان بەو مافە سەرەکییانەی نەتەوەی کورددا بنێ.
ئەمە وەک پرینسیپێکی سەرکیی و تیۆریی، لە رووی مافی چارەنووسی نەتەوەکانەوە، هیچ جۆرە چەن و چوونێ هەڵ ناگرێ. بەڵام، گەر تەماشایەکی باروودۆخی ئەوڕۆی « کوردستان » و رەوشی « رامیاریی، ئابووریی و کۆمەڵایەتیی » رێکخراوەکان و نەتەوەی کورد بکەین، ئەوا بۆمان دەردەکەوێ، لە رووی پراکتیک، توانا و دەسەڵاتەوە، ئەوڕۆ، ئەو توانا گەورەیەمان نییە، تا لەم قۆناغەدا، ئەو ئامانجە رەوا پیرۆزە نەتەوەییانە بەدەستبێنین. بۆیە پێویستە، لە هەموو پارچەکانی « کوردستان »دا، لە مافی « فیدراڵیی » کەمتر داوا نەکرێ، # لەگەڵ هێزە بەر چاو روونەکانی ئۆپۆزیسیۆنی گەلانی سەردەسەی ئەو دەوڵەتانەدا هەوڵبدرێ، دەوڵەتێکی دیمۆکراسیی فیدراڵیی دامەزرێنرێ، بە مەرجێ، دان بە هەموو مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورددا بنێن، کە لەم قۆناغەدا، خۆی لە مافی « فیدراڵیی »دا دەنوێنێ. بە تایبەتیی، رۆژی « 19 .05. 1992 »، پەرلەمانێکی « شەرعیی »، لە لایەن رۆڵەکانی گەلەوە لە « باشوور » هەڵبژێردراوە، (لە « 4/ئەکتۆبەری/1992 »شدا، ئەنجوومەنی نیشتمانیی کوردستان، بڕیاری لە سەر سیستێمی فیدراڵیی بۆ گەلی کورد لە باشووری کوردستاندا داوە.)«63،2»
بۆیە، هەر کەس و هەر لایەنێکی رامیاریی « کوردستان »، لەو بڕیارە لابدا و لێی پەشیمانبێتەوە، لە سەر مافەکانی گەل، بە تەنیا لەگەڵ دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق »دا، گفتوگۆ و دانوستان بکا، ئەوا، تاوان و ناپاکییەکی گەورە، بەرانبەر نەتەوەی کورد دەکا.
لە کۆتاییدا دەڵێم: گەر ئەوڕۆ، سەرانی رێکخراوە « کوردستانیی »یەکان، لە ئاستی « چەلەبیی » و هێزە بێ دەسەڵاتەکانی ئۆپۆزیسیۆنی « عێراق »دا نەوێرن، باسی مافە رەواکانی گەلی کورد لە « باشووری کوردستان »دا بکەن، ئەو « فیدراڵیی »یەی خۆیان و پەرلەمانی « کوردستان »، بڕیاریان لە سەر داوە، پێیان بسەلمێنن، ئەدی دەبێ، لە ئاستی دڕندەیەکی وەک « عەلی

کیمیاریی » و پیاوکوژێکی وەک « سەددام » دا، چی بڵێن و داوای چییان لێ بکەن؟! چۆنچۆنی گفتوگۆیان لەگەڵدا دەکەن؟!! بە چ شێوەیە، ناوی شارەکانی « کەرکووک، خانەقین » و نێوچەکانی دیکەی « باشووری کوردستان » دەبەن؟ وا بزانم، گەر ئەو پیاوانە، بەو شێوەیە رەفتاربکەن، کورد پێویستی بەو سەرکردە، رووناکبیر و نووسەرانە نییە، کە لە ئاستی داگیرکەراندا بێ دەنگ دەبن و ماتومەلووڵ ڕاوەستن، نەتوانن، زار هەڵبێننەوە و داوای مافە ڕەواکانی گەل بکەن. کەچیی، لە کۆبوونەوە جەماوەرییەکاندا، کاتێ « مەزاد »ی رامیاریی، لە سەر کێشەی « کەرکووک » گەرمدەبێ، بۆ ئەوەی، کۆمەڵانی خەڵک لە خشتەبەرن، جەماوەر بە لای خۆیاندا ڕاکێشن، « بارزانیی »، شاری « کەرکووک » بە « دڵ » و « تاڵەبانیی »ش، بە « قودس »ی « کوردستان »ی دادەنێن! سیارە، ئەو جۆرە کەسانە، بۆ یەکدی کوشتن، تالانکردن، ئاوییوکردن و کاولکردنی « کوردستان »، لە شێر بە هێزتر، لە پڵنگ بە هەڵمەتر و لە ڕێوی زۆرزانترن، بەڵام، لە ئاستی دوژمنە سەرەکییەکانی نەتەوەی کوردیشدا، لە مەڕ هەژارترن و زار لە دەمیاندا نییە!
ئەورۆ، کاتی ئەوە هاتووە، لە ڕاستیی، درووستیی و ڕەوایی کێشەکەمان، گەلانی دراوسێ و جیهان تێبگەیەنین، بە ڕاشکاویی، هەموو داخوازییەکانی نەتەوەی کوردیان بۆ باسکەین، تا وردەوردە، گوێیان بەو داخوازییە ڕەوایانەی نەتەوەی کورد ڕابێنین. لە هەمان کاتیشدا، کاتی ئەوە هاتووە، گەلانی دراوسێشمان، چاوێ بە باوەڕ، نەخشە و پلانەکانی خۆیاندا بخشێننەوە، خۆیان، لە هەموو بیدێکی شۆڤێنیستانەی نەتەوەی بالادەس رزگارکەن، تا هەموو پێکەوە، بە ئازادیی و بەختەوەریی، وەک مرۆ بژین، دەوڵەتە هاوبەشەکانمان ئاوەدانکەینەوە و کاروبارەکانیشی، بە ڕێکوپێکی بەڕێوەبەرین، گەر بە ڕاستیی، دەوڵەتەکانی « توورکیا، ئێران، عێراق و سووریا »، وەک چوار دەوڵەتی فرە نەتەوە و نیشتمان وان، بە لانە و نیشتمانی هاوبەشی ئەو گەلانە دادەنرێن؟!! ئەگینا، با لەوە پتر، نە خۆمان هەڵخەڵەتێنین و نە کوری کوردیش، لە پێناوی برایەتی درۆزنانەی گەلانی بندەس و سەربەدەستی ئەو چوار دەوڵەتەدا، بە کوشت بدەین!

ستۆکهۆلم
1997. 11. 01

* * *

**تێبینییەکان :**

* ڕۆژی « 1999.07.03 »، لە « قەڵاچوالان »، چاوم بە « جەلال تاڵەبانی » کەوت، دەربارەی کێشەکە و هەموو بۆچوونەکانی دوکتۆر « چەلەبی »، کورتەیەکم بۆ باسکرد. کەچی گوتی: نەک هەر ئەو، بەڵکوو، « ئەیاد عەلاوی »ش، دان بە « کوردستانێتیی » شاری « کەرکوک »دا نانێ!

ئاخر، ئەو « عەلاوی »یە شۆڤێنیی و کۆنە « بەعسی »یەی، ئێستە سەرۆک شالیارانی « عێراق »ە، هەر دوو سەرکردەی پارتی گەورە و دەسەڵاتدار « بارزانیی » و « تاڵەبانیی »، دەنگیان بۆ داوە و ڕێزی لێ دەگرن! جا ئیدی، ئەمە شتێ نییە، پێشەکیی نەیانزانیبێ، ئەو سەرە شۆڤێنیستانە، دان بە « کوردستانێتیی » خاکی « کەرکووک »دا نانێن! بەڵام، کارێکی زۆریان بۆ نەکردووە و بایەخیان پێ نەداوە، هەر وەک ئەوڕۆ دەبینین. بە چ شێوەیە، بایەخ بە شاری « کەرکوک » دەدەن، مەگەر بۆ ڕیکلامی هەڵبژاردن، باسیکەن!!!

# دوای حەوت ساڵ، « حیزبی دیمۆکراتی کوردستانی ئێران »، ساڵی « 2004 » و لە کۆنگرەی سیازدەیاندا، خۆشبەختانە، وازیان لە دروشمی کۆنی « ئۆتۆنۆمیی » هێنا و دروشمی « فیدراڵیی »یان بەرزکردەوە. هەر چەندە، ماوەی پتر لە نیو سەدە دەبێ، ئەو دروشمەیان بەرز کردبۆوە، بەڵام، هەر وەک پەندە « ڕووسی »یەکە دەڵێ: گەر بشەوێ، کارێکی نوێ دەستپێبکەی، هەرگیز درەنگ نییە!

**سەرچاوەکان :**

1. جمال نبز، حول المشكله الكرديه، 1969.
2. دوکتۆر حوسێن محەمەد عەزیز، فیدراڵیزم و دەوڵەتی فیدراڵ، چ1، سوید، 1996.
3. جمهوريه الخوف، الترجمه الكامله سمير الخليل و احمد رائف، دار الخيل للطباعه و النشر و التوزيع، اثينا - اليونان، 1996.
4. دستور حزب البعث العربي، مطبعه الاعتدال، دمشق.
5. ساطع الحصري، ما هي القوميه ؟ بيروت، نيسان1985.

# کورتەیەکی دەقی گوتارەکە

بۆ ئەوەی، فایلێکی تایبەتیی، بۆ گرفتە رامیارییەکانی راگواستن و بە عەرەبکردنی شاری « کەرکووک » بکەینەوە، بە مەرجێ، ئەو فایلە، لە ئاستی پێویستدابێ و ئامانجەکانی خۆی بەدیبێنێ، پێویستی بە هەوڵێکی زۆر و بەتەنگەوەهاتنێکی دڵسۆزانە هەیە.

گەر بە شێوەیەکی بەردەوام هەوڵبدەین، سەرچاوەیەکی زۆر کۆکەینەوە، چ بە شێوەی نووسراو و بەڵگەنامەکان بێ، چ چاوپێکەوتن لەگەڵ راگوێزراوەکاندا بکرێ، بە مەرجێ، هەمووی بە کامێرای ڤیدیۆ تۆمارکرێ، ئەوا لە ئایندەدا، ئەو فایلە کەڵەدەکرێ.

لێرەدا، تێبینییەک هەیە، ئەویش ئەوەیە: گەر تەنیا هەر، مەبەست لە فایلی « کەرکووک »، بەعەرەبکردن و راگواستنی پارێزگەی « کەرکووک » و نێوچەکانی سەر بەو شارە بێ، ئەوا، ناوەکە لە جێی خۆی دایە. بەڵام، گەر مەبەست، لە هەموو نێوچە بەعەرەبکراو و راگوێزراوەکانی « کوردستان » بێ، ئەوا ئەو ناوە، لەگەڵ مەبەستەکەماندا ناگونجێ. بەڵکوو باشتر وایە: یا فایلێکی گشتیی، بۆ هەموو نێوچە بەعەرەبکراوەکانی « کوردستان » بکرێتەوە، یا هەر نێوچە و شارێ، فایلێکی تایبەتیی هەبێ، وەک: « فایلی کەرکووک، فایلی خانەقین، فایلی شەنگار ... تاد »

بۆ رێوشوێن و شێوازی کارکردنی فایلەکەش، ئەز پێشنیازدەکەم، لە خۆمانەوە دەستپێبکەین و بەم شێوەیەی لای خوارەوە بێ:

1. بۆ کارێکی نەتەوەیی وا چارەنووسسازانە و ستراتیژییانە پێویستە، هەموو رێکخراو و پارتە رامیارییەکانی « باشووری کوردستان »، یەکدەنگ و یەکگرتووبن. ئەم کارە، بە تەنیا، بە هیچ لایە جێبەجێ ناکرێ. بەڵکوو، بە هەوڵ و تێکۆشانی بێ وچانی، هەموو گەلی کورد لە « باشوور »دا و رێکخراوەکانی بەدیدێ.
2. هەموو لایەنە کوردییەکان، لە کردنەوەی ئەو فایلەدا بەشداربن. کۆمیتەیەکی تایبەتیی هەبێ، لە سەر جۆری زانیارییەکان رێککەون و بڕیاری لە سەر بدەن.
3. ئاشکرایە، کورد بۆ خۆی هیچ جۆرە بەڵگەیەکی مێژوویی پێویست نییە، تا بیسەلمێنێ، « کەرکووک » شارێکی « کوردستان »ە. بۆیە، نووسین و بەڵگەکان دەبێ، لە ئاستێکی بەرزی « مێژوویی، جوگرافیایی، رامیاریی و کەلتووریی »

ئەوتۆدا بن، باوەڕ بە دۆست و دوژمنەکانمان بێنن. لە « سۆز، قسەی بازاڕیی، گاڵتەجاڕیی، پلارتێگرتن، درۆوەدەلەسە » بە دووربن. بە شێوەیەکی جوان، ئەکادیمییانە و بە زمانی سەردەم بنووسرێن و پێشکەشکرێن.

4. پێویستە، هەموو ئەو زانیارییانەی کۆدەکرێنەوە، لە دووتوێی نامیلکەیەک یا پەرتووکێکدا تۆمار و چاپکرێن. بە زمانەکانی « کوردیی، عەرەبیی، ئینگلیزیی و فرەنسیی » بڵاوکرێنەوە.

5. کەڵک لە هەموو سەرچاوە و بەڵگەنامە مێژوویی، جوگرافیایی، بڵاوکراوە جۆربەجۆرەکانی، هەر دوو دەوڵەتی « عێراق » و « بریتانیا »، لە سەردەمە جیاوازەکاندا و ناسەوارەکان وەرگیرێ، تا مێژوویەکی نێرین و ڕاستەقینەی شاری « کەرکووک » و نێوچەکانی دەوروبەری، ژمارەی دانیشتووان، پێکهاتەی نەتەوەیی و ڕێژەی هەر گەل و کەمینەیەک دیارییکرێ.

6. کەڵک لە هەموو سەرژمێرییە گشتییەکانی دەوڵەتی « عێراق » بە گشتیی و سەرژمێری ساڵی « 1957 » بە تایبەتیی وەرگیرێ، وەک بنچینەیەک، بۆ دیارییکردنی ڕێژەی کورد، بەرانبەر ڕێژەی « عەرەب، توورکمان، ئەرمەن، کلدان و ئاشووریی » مامەڵەی لەتەکدا بکرێ.

7. دوو کۆمیتەی تایبەتیی، لە شارەزایان و پسپۆڕان دامەزرێنرێ. کۆمیتەی یەکەم: بۆ کۆکردنەوە و تۆمارکردنی هەموو زانیارییەکان بێ. کۆمیتەی دووەمیش: بۆ لێکۆڵینەوە، پوختەکردن، ساغکردنەوە، تۆمارکردن و بڕیاردان، لە سەر ڕاستیی و درووستیی زانیارییەکان دامەزرێنرێ.

8. باشتر وایە، پەرلەمانی « کوردستان »، بڕیار لە سەر دوا ڕاپۆرتی ئەکادیمیی، دەربارەی زانیارییەکانی نێوچە بە عەرەبکراوەکان و ڕاگوێزراوەکان بدا و پشتگیرییبکا، نەک بە ناوی لایەنێکی دیارییکراوەوە بێ.

9. لە ڕاستییدا دەبووایە، پەیمانگەیەکی سەربەخۆ بۆ لێکۆڵینەوە، لە دەرکەوتەکانی « بەعەرەبکردن، ڕاگوێزان، بە بەعسییکردن، کیمیاباران، گازی ژاراویی و ئەنفالەکان » دامەزرابە. هەموو دەکۆمێنتەکانی کۆکردایەتەوە، لێکۆڵینەوەی ورد و زانستانەیان، لە سەر بکردایە، ناوبەناو، بە چەن زمانێکی زیندووی گەلانی جیهان، بەرکۆڵێکیان لێ بڵاوکردایەتەوە.

10. دەمێنێتەوە سەر ئەوەی بزانین، چۆن هەڵسوکەوت، لەگەڵ خۆمان و دەور و بەرەکانمان دەکەین. دوای ئەوەی، گەلی کورد لە « باشووری کوردستان »، لە سەر هەموو زانیارییەکان ڕێکدەکەوێن، پاشان دەبێ، لەگەڵ کەمینە نەتەوەییەکانی وەک: « توورکمان، ئەرمەن، کلدان و ئاشووریی » قسەبکەین. بەرنامە و پرۆژەکانیان بۆ ڕوونکەینەوە. بەرژەوەندییە نەتەوەییەکانیان، لەو

جێیانەی هەن، ڕەچاوکەین. چونکە، هەرچەندە « کەرکووک » شارێکی دێرینی « کوردستان »ە، بەڵام، بمانەوێ و نەمانەوێ، ئەورۆ بە شارێکی فرەنەتەوەیی و تێکەڵاو دادەنرێ. واتە: « کەرکووک » موڵکی هەموو ئەو خەڵکانەیە، کە لە مێژوویەکی کۆنەوە، تێیدا دەژین. بۆیە دەبێ، لەگەڵیاندا ڕێککەوین، تا ئەوانیش، پشتگیریی داواکارییەکانمان بکەن. نەک لە کاتی کۆڵینەوە و بڕیارداندا، بە لای « عەرەب »دا داشکێن. یا، « کەرکووک » بە شارێکی توورکمان بناسێن، وەک هەر لە ئێستەوە، هێندێ ڕێکخراوی شۆڤێنیی و گومانلێکراو، بانگاشەی بۆ دەکەن!

11. هەموو ئەو عەرەبانەی، لە مێژوویەکی کۆنەوە، لە نێو شاری « کەرکووک » و دەوروبەرەکەیدا نیشتەجێکراون و دەژین، تەنیا، بە مەبەستی ژیان و لەوەڕاندنی ئاژەڵەکانیان، لەو نێوچانەدا گیرساونەتەوە، ڕێژە و ژمارەیان کەمە و هیچ مەترسییەک، بۆ سەر « کوردستانێتیی » شاری « کەرکووک » دروست ناکەن و گەر بشمێننەوە، زیانیان نییە. بەڵام، هەموو ئەو عەرەبە دەشتەکیی و خێڵەکییە بیابانشینانەی، لە سەرەتای ساڵەکانی شەستەوە، لەوێ چێنراون، بە هیچ شێوەیەک نابێ، ژمارەیان، لەگەڵ ژمارەی کورد و کەمینەکانی دیکەدا حسێبکرێ، بە دانیشتووی ڕەسەنی « کەرکووک » دانرێن. جا گەر باریش نەکەن و بۆ جێی پێشووی خۆیان نەگەڕێنەوە، ئەوا نابێ، لە سەرژمێردا، بە دانیشتووانی ڕەسەنی « کەرکووک » دانرێن.

12. لە ڕاستییدا، هەموو عەرەبێکی بە وێژدان و بێ ویژدان، زۆر باش دەزانن، « کەرکووک » شارێکی دێرینی « کوردستان »ە. بەڵام، کەم عەرەب هەیە، دان بەم ڕاستییەدا بنێ. ئەوانەی دانیشی پێدا دەنێن، توانا و دەسەڵاتیان نییە. ئەوانەی دانیش، بەو ڕاستییەدا نانێن، ئەوا، هەموو بەڵگە و هیوایەکیان، تەنیارتەنیا، چەواشەکردن، هەڵخەڵەتاندن، بەکارهێنانی هێز و داگیرکردنە. دەیانەوێ، لە ماوەیەکی کەمدا، شارەکە و نێوچەکە، بە تەواویی عەرەبڕێژکەن و ڕوخساری جوگرافیایی و مێژوگرافیای « کەرکووک »، بە تەواویی بشێوێنن. هەر وەک جێگری سەرۆک شالیاران « تاریق عەزیز »یش، بە ڕاشکاویی گوتوویەتی. (عەرەب، چۆن « ئەندەلوس »ی لەکیس چوو، کوردیش دەبێ، تا ماوە، فرمێسکی گەرم بۆ « کەرکووک » بڕێژێ!).

13. هەموومان دەبێ، ئەو ڕاستییە زۆر باش بزانین، تا « سەددام حوسێن » بمێنێ و پارتی « بەعس » دەسەڵاتی هەبێ، چ « کەرکووک » و چ هەموو نێوچە بەعەرەبکراوەکانی دیکەش، هەر وا بە ئاسانیی ناسەندرێنەوە و بە هیچ شێوەیە ئامادە نین، دان بە « کوردستانێتیی » ئەو نێوچانەدا بنێن. بۆیە

دەبێ، هەموو هەوڵ و تەقەلایەکمان، لەگەڵ نەیارەکانی « سەددام » و ڕژێمی « بەعس »دا یەکخەین. خۆمان لەگەڵ هێزەکانی دژ بە« سەددام » لە « عێراق » و نێوچەکەدا بگونجێنین. کەڵک لەو بارە نالەبارە و پێوەندییە خراپەی، نێوان « عێراق » و « کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان » بە گشتیی و هەر دوو دەوڵەتی گەورە و بە توانای « ئەمێریکا » و « بریتانیا » وەرگرین، تا ڕۆژێ زووتر، « سەددام » و داروودەستەکەی بڕوخێن و لەنێوچن.

14. پێویستە، دەربارەی کێشەی بەعەرەبکردن و ڕاگوێزانی کورد، لە نێوچە بە عەرەبکراوەکاندا، هەر چی زووە، کۆنگرەیەکی فراوان بگیرێ، هەموو هێزەکانی ئۆپۆزیسیۆنی « عێراق »، نووسەر، پیاوانی ئایینیی، ئەکادیمییەکان، « لەو عەرەب و کەمینانەی لە ژێر دەسەڵاتی ڕژێمدا نین » بانگکرێن، دۆسیەی ئەو نێوچانەیان پێش چاوخرێ، دەمەتەقێیەکی زۆریان لەگەڵدا بکرێ، بۆنی دەمیان تاقیکرێتەوە، هەڵبدرێ، هەر لە ئێستەوە، باوەڕیان پێ بهێنرێ، کە « کەرکووک » شارێکی « کوردستان »ە و پێویستە، لە نێو چوارچێوەی سنووری میریی فیدراڵیی « کوردستان »دا دانرێ، وەک دەکومێنتێکی مێژوویی، بۆ دوای ڕوخاندنی « بەعس » هەڵگیرێ، تا لە ئاییندەدا، تووشی گرفت نەبین و سەرلەنوێ تێهەڵ نەچینەوە. ئەگینا، گەر ئێستە، کێشەی « کەرکووک »، لەگەڵ ئەم هێزە لاواز و پەرشوبڵاوانەی دژ بە « سەددام » و « بەعس »دا، یەکلایی نەکەینەوە، سبەینێ، دەسەڵات وەرگرن، گەر لە « سەددام » خراپتر نەبن، باشتر نابن. کێشەی کورد بە گشتیی، گرفتی « کەرکووک » و هەموو نێوچەکانی دیکەی بەعەرەبکراو بە تایبەتیی، سەختتر و ئاڵۆزتر دەبن!

15. کێشەکەمان زۆر سەختە. بەڵام، داواکارییەکەمان زۆر ڕەوایە. لەبەرئەوە، مافێکی ڕەوا و سرووشتیی خۆمانە، هەر ڕێگە و شێوازێ، بۆ سەندنەوەی « کەرکووک » بەکاربێنین. بە هەر شێوەیە، هەوڵ بۆ ساغکردنەوە و چەسپاندنی ڕاستییە مێژوویی و جوگرافیاییەکان بدەین. چونکە، مەگەر هەر تەنیا کورد خۆی بزانێ، چ جۆرە غەدرێکی نەتەوەیی و مێژوویی لێکراوە، بە چ شێوەیە، لە سەر خاکی بابوباپیرانی خۆی دەرکەنراوە. بۆیە، بەپێی هەموو باوەڕێکی ئاسمانیی و زەمینیی، هەرچی بۆ سەندنەوەی مافە نەتەوەییەکانی خۆی بکا، ڕەوایە.

16. بە هیچ شێوەیە نابێ، پڕۆسێسی گاڵتەجاڕی سەرژمێری گشتیی، لە نێوچە بە عەرەبکراوەکانی « کوردستان »دا، بۆ هیچ ڕژێمێکی « عێراق » بسەلمێنرێ. چونکە، جگە لەوەی، عەرەبێکی زۆریان هێناوە، کرێی و دزیی، لە

سەرژمێرەکەدا دەکەن، وەک ئەوەش وایە، مرۆ شێروخەت، لە سەر ماڵی خۆی بکا! ئاخر، چۆن دەبێ، سەرژمێر قەبووڵکەین، گەر ئێمە، باوەڕێکی تەواومان بە «کوردستانێتیی» ئەو نێوچانە هەبێ؟!! ئەدی گەر زۆربەی دانیشتووان، کورد دەر نەچوون، ئەو کاتە، سەرانی کورد چی دەڵێن؟!! چی دەکەن؟!! ئایا، بە ئەنجامی سەرژمێرەکە قایلدەبن و واز لە شاری «کەرکووک» دێنن؟!! یا دیسانەوە، چەک هەڵدەگرن و چیاکان لە ڕژێم دەگرنەوە؟!!
17. دەبێ، ئەوە زۆر باش بزانین، هەر لەو ڕۆژەوە، دەوڵەتی «عێـــراق» دامەزراوە و ولایەتی «مووسڵ» بە «عێراق» ەوە لکێنراوە، کاربەدەستانی ئیمپریالیزمی «ئینگلیزیی» هەوڵیانداوە، شاری «کەرکووک»، وەک شارێکی «عێراق» بناسێنن و لە هەموو ڕوویەکەوە، لە نێوچەکانی «باشووری کوردستان» ی دابڕن. تەنانەت، ئەمەشیان نەشاردۆتەوە و «ئەمەریکا»، لە کۆبوونەوەی «Asian Royal Assosiation»، ڕۆژی «1966. 10. 25»، زۆر بە ڕاشکاویی، دەربارەی «کەرکووک» گوتوویەتی:(هەر میرییەکی عێراقیی، ڕێز لە خۆی بگرێ و بە تەنگ بوونی خۆیەوە بێ و سوودی خۆی لە بەر چاو بێ، پێویستە، بە هیچ جۆرێک، ڕێگەی ئەوە نەدا، «کەرکووک» بە بەشێک لە کوردستان بژمێررێ.)*
ئەمەش، تەنیا لەبەرئەوەیە، «کەرکووک»، نەوتێکی زۆری تێدایە! بۆیە دەبێ، کورد ئەم خاڵەش، بە باشیی ڕەچاوکا، بزانێ، لە کوێوە دەستپێدەکا؟ لەگەڵ کێ قسەدەکا و چ جۆرە بەڵێنێ، بە دەوڵەتەکانی نێوچەکە و جیهان دەدا؟!! چونکە، ئەو دەوڵەتە زلهێزانە، تەنیا نەوتیان دەوێ، هەر وا بە خۆڕایی، دڵداریی، لەگەڵ هیچ گەلێکی نێوچەکەدا ناکەن!
18. بۆ ئەوەی بیسەلمێنین، «کەرکووک»، شارێکی «کوردستان» ە، تەنیا هەر ئێندە بەس نییە، خۆمان باوەڕمان بە «کوردستانێتیی» شاری «کەرکووک» هەبێ. بەڵکوو دەبێ، هەوڵێکی زۆری ڕامیاریی و دیپلۆماسیی بۆ بدەین. بۆیە دەبێ، فایلی «کەرکووک» و نێوچەکانی دیکەی «باشووری کوردستان» ی بەعەرەبکراو، پێش چاوی «دادگەی کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان» بخرێ، دەربارەی بەعەرەبکردن، ڕاگوێزان، زۆرداریی و چەوساندنەوەی ڕۆڵەکانی گەلەکەمان شکاتبکرێ.
19. نامەیەکی کراوە، بە ناوی دانیشتووانی نێوچە بەعەرەبکراوەکان و خەڵکە دەربەدەرکراوەکانەوە، بۆ «سەرۆک، میر، شاکان» ی عەرەب و دەوڵەتە ئیسلامییەکان بنووسرێ. هەروەها، وێنەی بۆ ڕێکخراوە دیمۆکراسیی و پیشەییەکان، پارتە ڕامیاریی و سەرۆک کۆماری دەوڵەتەکانی جیهان

بنێررێ. باسی باری ژیانی نالەباری، ئەو کوردانە بکرێ، داوای کۆمەک و یارمەتییان لێ بکرێ و بەشی زۆریان نیمزابکەن، تا، گەر « کەرکووک » و نێوچەکانی دیکەشمان بۆ نەسەندنەوە، بە لانی کەمەوە، ئەو شالاوە گەورەیەی بەعەرەبکردن، ڕاگواستن و دەرکردن بوەستێنن.

20. وەک چۆن، « فلەستینیی »یەکان، هەوڵێکی زۆری ڕامیاریی و دیپلۆماسیی، بۆ شاری « قودس » دەدەن، کوردیش پێویستە، بەو شێوازە و لە ڕێی تێکۆشانی ڕامیاریی و دیپلۆماسییەوە، خەباتێکی زۆر بکا، لەگەڵ پارت، دەوڵەتەکانی جیهان و دۆستەکانی نەتەوەکەماندا، لەو بارەیەوە، زۆر بە ڕاشکاویی قسەبکەن، بە زمانە جیاجیاکانیان، ڕاستییەکانیان پێش چاو بخەن.

21. گومانی تێدا نییە، هەموو ڕاستییە مێژووییەکان، لە ئاستی بەکارهێنانی زۆر و توندوتیژییدا، تا ماوەیەک ملکەچ دەبن. بەڵام، گەر ئەوڕۆ چارەسەرێ، بۆ کێشەی بەعەرەبکردن نەدۆزرێتەوە، ئیدی، واتای ئەوە نییە، دەبێ، وەک گەلێک دۆشدامێنین و هیوابڕاوبین. بەڵکوو دەبێ، هەر لە ئێستەوە هەنگاوبنێین، چونکە، لە پاشەڕۆژدا کەڵکیاندەبێ.

22. ئەز لەو باوەڕەدام، کێشەی بەعەرەبکردن، پێوەندییەکی توندوتۆڵی، بە مانەوەی « سەددام » و « بەعس »ەوە هەیە. گەر ئەو ڕژێمە بگۆڕدرێ، ئەو کێشەیەش، گەر بە تەواویی بنەبڕ نەکرێ، هێندە تاووتینی نامێنێ. بەڵام، هەر لە ئێستەوە کاری دەوێ. گەر ڕاپەڕینێکی دیکەی کوردانە، لە کات و سەردەمی گونجاوی خۆیدا بەرپابێ، زۆربەی زۆری ئەو عەرەبە هێنراوانە، خۆیان بار دەکەن و هەڵدێن. چونکە، خاوەنی کێشەیەکی ڕەوا نین، خۆشیان باش دەزانن، خاک و ماڵی خەڵکی دیکەیان داگیرکردووە، تا سەریش بۆیان نالوێ، لە تەڕ بخۆن و لە ووشک بنوون! جگە لەوەی، هێندێکیان بە زۆر و هێندێکی دیکەشیان، بە دەمچەورکردن هێنراون، لە کێڵگەی پڕ بە پیتی خاکەکەماندا چێنراون. بەڵگەشمان ئەوەیە، دوای ڕاپەڕینە مەزنەکەی بەهاری « 1991 »، زۆربەیان شاری « کەرکووک »یان چۆڵکرد و هەڵاتن.

23. زۆر پێویستە، پێش هەموو لایەنەکانی دیکە، خۆمان، بڕیار لە سەر کێشە و گرفتەکانی خۆمان بدەین و چارەسەریان بۆ بدۆزینەوە. بۆیە دەبێ، پەرلەمانی ڕاستەقینە و یەککگرتوو، سنووری جوگرافیای « کوردستان » دیارییکا و هەر لە « خانەقین »ەوە تا « زاخۆ » دەستنیشانکا. زنجیرە چیاکانی « حەمرین »، وەک سنوورێکی سروشتیی و مێژوویی، نێوان « باشووری کوردستان » و « عەرەبستانی عێراق » بناسێنێ. زۆر جەخت، لە سەر ئەم

لایەنە بکەن و لە بەرنامە و دەستووری گەلی « کوردستان »دا بچەسپێنرێ. هیچ کەسێ، سەرکردەی ڕێکخراو و پارتێکی کوردیی و « کوردستانیی »، بە هیچ جۆرێ، بۆی نییە، دەسکاریی سنووری سروشتیی « کوردستان » بکا. واز لە یەک بستی خاکی « کوردستان » بێنێ. تەنیا دەبێ، لە ڕیفراندۆمێکی ئازاد و گشتییدا، بڕیارێکی ستراتیژیی و چارەنووسسازانەی لەو بابەتانە بدرێ. ئەویش، مەرج نییە، لە سەردەمێکی دیکەی مێژوویدا، نەوەکانی داهاتووی کورد، بە ئەنجامی ئەو ڕیفراندۆمەش قایلبن!
کێشەی وازهێنان لە هێندێ « گوند، شارۆکە، شارۆچکە و شار »، تەنانەت، لە یەک بستە خاکیش، وەک کێشەی مافەکانی نەتەوەی کورد نییە، ئەم ڕێکخراو و ئەو پارت، بە ئارەزووی خۆیان، دروشمی بۆ بەرزکەنەوە و دانوستانی لە سەر بکەن. وەک ئەوەی، ئەمیان داوای « ئۆتۆنۆمیی » و ئەوی دیکەشیان، داوای « فیدرالیی » بکا! چونکە، کێشەی خاک، لەگەڵ بوونی کورددا پەیدابووە و لەگەڵ نەمانی کوردیشدا نامێنێ!
24. پارتە ڕامیارییەکانی « کوردستان » دەتوانن، بە شێوەیەکی نهێنیی، ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ، بە هۆی هەر کەس و لایەنێکی دیکەوە بێ، پێوەندیی بە سەرۆک تیرە و هۆزە عەرەبە هێنراوەکانەوە بکەن، نامەیان بۆ بنووسن، یا، قسەیان لەگەڵ بکەن، تا تێیانبگەیەنن، ڕژێمی « عێراق »، چ جۆرە غەدرێکیان لە ڕۆڵەکانی ئەو نێوچانەی « کوردستان » و ئەوانیش کردووە. چۆن خاک، ئاو وماڵی ئەو کوردانەیان داگیرکردووە. چ جۆرە دوژمنایەتییەکیان بۆ خۆیان و نەوەکانی داهاتوویان درووستکردووە. بەڵکوو، هێندێکیان باوەڕبێنن و قایلبن، کاتێ بارەکە گۆڕا، بێ گرفت، نێوچەکان چۆڵکەن و بۆ شوێنی خۆیان بگەڕێنەوە.
25. گەر هەوڵدان و وتووێژ کەڵکی نەبوو، ئەوا دەتوانرێ، دەمیان چەورکرێ، هێندێ پارەیان بدرێتێ. لەبری ئەوەی، خاکەکەمان بە شەڕ بسەنینەوە، جارێکی دیکە، خاکەکەی خۆمانیان لێ بکڕینەوە. خۆ گەر، هیچ ڕێیەکی ئاشتییخوازانە و بەرتیلدانیش کەڵکی نەبوو، ئەوا دەتوانرێ، هەڕەشەیان لێ بکرێ، تێیان بگەیەنرێ، تا، تاکە کوردێ مابێ، واز لەو نێوچانە ناهێنێ، ئەو گرفتە نەتەوەییە، هەر بەردەوامدەبێ و ئەوانیش، لەو نێوچانەدا ناحەوێنەوە!
لە کۆتاییدا دەڵێم: وەنەبێ، ئەم کارە هێندە کارێکی ئاسانبێ، لە ماوەی چەن مانگێکدا بەدیبێ. چونکە، ماوەی حەفتا ساڵە، پرۆسێسی بەعەرەبکردن، لە « کوردستان »دا بەردەوامە. هەرچەندە، بەعەرەبکردن بە شێوەیەکی سیستماتیک، ماوەی چل ساڵێ دەبێ، دەسپێکردووە، لە لایەن چەن

میرییه‌کی شۆڤێنیی و پارتێکی ڕه‌گه‌زپه‌رستی فاشیی وه‌ک: « به‌عس »ه‌وه پیاده‌ده‌کرێ. به‌ڵام، ئه‌مه ئه‌وه ناگه‌یه‌نێ، ئیدی، هه‌موو شت کۆتاییهاتبێ! به‌ڵکوو، هێشتا زووه، ئه‌و بڕیاره بده‌ین. ئێمه‌ی کورد، پێویستمان به‌ یه‌کێتیی و ته‌بایی ڕیزه‌کانی گه‌ل هه‌یه. پێویستمان به‌ داکۆکییکردن و خۆڕاگریی هه‌یه. کێشه‌که‌مان سه‌خت و ئاڵۆزه، کارێکی زۆر، خه‌باتێکی هه‌مه‌جۆره، هه‌مه‌لایه‌نه و قوربانییه‌کی گه‌وره‌ی ده‌وێ، تا، به سه‌ر دوژمنه‌کانماندا سه‌رکه‌وین، ئامانجه‌کانمان به‌دیبێنین، « هه‌ر کاروانێکیش، ڕوویکاته خۆر، که‌مبێ یا زۆر، هه‌ر ده‌گاته خۆر. »

سـولەیمانیی
99. 08. 05

* * *

---

* محەمەد ڕەسووڵ هاوار، شێخ مەحموودی قارەمان و دەوڵەتەکەی خوارووی کوردستان، بەرگی دووەم، لەندەن ـ 1991، ل. 123.

# چەن سەرنجێکی دیکە،
# دەربارەی کێشەی «کەرکووک»

وا بزانم، هەرگیز پێویست ناکا، بە هاوزمانەکانم بڵێم، «کەرکووک»، شارێکی «کوردستان»ە! چونکە، هەموو کوردێکی دڵسۆز بۆ نەتەوە و نیشتمانەکەی خۆی، بە شارێکی خۆشەویست و گرنگی خۆی دەزانێ! بەڵام دەبێ، هەمیشە ئەوە دووپاتکەمەوە، نەک هەر شارێکی «کوردستان»ە، بەڵکوو، شارێکی «کوردیی»شە، چونکە، گەر «کوردیی» نەبێ، چۆن «کوردستانیی» دەبێ؟!! هەرچەندە، تەنیا هەر کوردی تێدا ناژی، بەڵکوو، هێندێ گرووپی ئیتنیی دیکەی وەک: «توورکمان، عەرەب، ئاشوور، ئەرمەن و کلدان»یشی تێدا دەژین.*
هەروەها، نەک هەر کورد، بەڵکوو، هەموو عەرەبێکی بە ویژدان و بێ ویژدانیش، باش دەزانن، «کەرکووک» شارێکی دێرینی «کوردستان»ە. بەڵام، ئەوان چاو لەو ڕاستییە دەنووقێنن و هەر بە شارێکی عەرەبیی دادەنێن! بۆ نموونە: سەرکردەکانی پارتی «بەعس»، سوور دەیانزانی، «کەرکووک» لە ڕووی «مێژوو، جوگرافیا و ئەتنۆگرافیا»وە، شارێکی دێرینی «کوردیی»یە و لە نێو سنووری خاکی «باشووری کوردستان»دا هەڵکەوتووە. کەچیی لەگەڵ ئەوەشدا، بە هیچ شێوەیە، دانیان بەو ڕاستییەدا نەدەنا، بەڵکوو، بە هەموو شێوەیەکیش هەوڵیاندەدا، ڕوخساری نەتەوەیی و جوگرافیایی ئەو شارە بگۆڕن. بەڵگەشم ئەوەیە، سەرکردەیەکی وەک «تاریق عەزیز»، زۆر بە ڕاشکاویی گوتوویەتی: (عەرەب چۆن «ئەندەلوس»ی لەکیسچوو، کوردەکانیش، کاتێ لە «سولەیمانیی»یەوە، بەرەو «بەغدا»، بە نێو «کەرکووک»دا تێپەڕدەبن، دەبێ، تاماون، هەر ئاوڕی لێ بدەنەوە و فرمێسکی گەرمی بۆ هەڵڕێژن!) ئەمە، خۆی لە خۆیدا، ئەوە دەسەلمێنێ، سەرکردەکانی پارتێکی فاشستی ڕەگەزپەرستی وەک «بەعس»یش، سوور دەیانزانی، «کەرکووک» شارێکی عەرەبیی نییە، بەڵام، بۆنی نەوت، لە هۆش

خـۆی بردبوون و هەمـوو بەهـایەکی مـرۆییـیـان لەبیـرچووبـۆوە! بۆیە، هـیچ بایەخێکیان بە شاری « کەرکووک » نەدەدا، بەڵکوو، تەنیا هەر هەوڵیاندەدا، سامانەکەی تالانکەن، زۆرترین بڕی نەوت دەربێنن و بیفرۆشن، نەبا، ڕۆژێ لە ڕۆژان بەرنامـەی بەعەرەبکردن و ڕاگوێزانی دانیشـتـووانە کوردەکـەی سـەر نەگرێ!
هەر وەک چۆن، زۆربەی هـەرە زۆری عـەرەبەکان، دان بە « کـوردسـتـانێـتـیی » شـاری « کەرکووک »دا نانێن، هەروەها، توورکمانەکانیش دانی پێدا نانێن و بە شـارێکی خۆیانی دەزانن. بۆ نموونە: گەر چاوێ بە پەرتووکی « شـوهەداء ئەلتورکـمـان »دا بخـشـێنین، دەبینین: توورکـمـانە مـوسـوڵمانەکان، زۆر بێ شەرمانە،(پازدە نێوچەی وەک: « تەلەعفەر، دەرروبەری مووسڵ، ئاڵتونکۆپری، کەرکووک، تسـعین، تازە، بەشیر، داقـووق، ئیـمـام، توزخـورمـاتوو، ئامرلی و گوندەکانی بەیات، قـەرەتەپە، میقدادیە، مەندەلیی »یان، بە خـاکی توورکـمـان داناوە. هەروەهـا، هێندێ نێـوچەی دیکـەی وەک: « قزلبـات، نـاوەندی هەولێـر، ئەلقەزانیە و کفریی »ش هەر بە هـی خۆیان دەزانن، تەنانەت « شەبەک »ەکانی « مووسڵ »یشیان، هەر بە توورکمان داناوە!)«1،39-53»
ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد بە گشتیی و گەلی کورد لە « باشـــوور » بە تایبەتیی دەبێ، ئەوە زۆر باش بزانن، « کوردسـتـان » بێ « کەرکووک »، لە مـەلێکی باڵ شکاو نەبێ، لە هیچی دیکە ناچێ! لەبەرئەوە پێویستە،، دوو خاڵی گەلێ گرنگ ڕەچاوکەین:
1. ئەو خاکە، تەنیا خاکی نەتەوەی کوردە و ئەو گرووپە ئیتنیکانەی دیکەی لە سەری دەژین، لە سەردەمێکی مێژوویی دیارییکراو و بۆ مەبەستێکی تایبەتیی هاتوون، یا هێنراون.
2. لە شـاری « کەرکووک » نە نەتەوە، نە گەل و نە کەمـەنەتەوەیی تێدا نییە، بەڵکوو، ئەم گرووپە ئیتنیکانەی تێیدا دەژین، هەر یەکەیان، بە بەشێ لە گەل و کەمینە تایبەتییەکانی خۆیان دادەنرێن. بۆ نموونە: کوردەکانی شـــــــاری « کەرکووک »، بەشێ لە گەلی کوردی « باشووری کوردستان »، عەرەبەکان، بەشێ لە گـەلی عـەرەبی « عـێراق »، توورکـمـانەکـانیش، بەشێ لە کـەمـینەی توورکمانی « باشووری کوردستان » و « عێراق » پێکدێنن.1*
ئەز پێم وایە، کلیلی ڕزگـاریی و سـەربەخـۆیی « باشـووری کـوردسـتـان »، بە دەروازەی شاری « کەرکووک »ەوە هـەڵواسراوە و گەلی کورد، بێ ئەو کلیلە، هەرگـیـز نـاتوانێ، ئـەو دەروازە داخـراوە بکاتـەوە و سـەربەخـۆیی تـەواویش بەدەستبێنێ. چونکە:

1. له هه‌موو ڕوویه‌که‌وه، به نیوچه‌یه‌کی ده‌وڵه‌مه‌ند داده‌نرێ، به تایبه‌تیی، سامانێکی زۆری نه‌وتی «کوردستان»ی تێدا هه‌یه و نه‌ک هه‌ر به‌شی کورد، به‌ڵکوو، به‌شی هه‌موو جیهانیش ده‌کا.

2. کورد ده‌توانێ، وه‌ک کارتێکی به‌هێز، له گه‌مه‌ی نێو ده‌وڵه‌تاندا به‌کاریبێنێ، له سه‌ر کێشه‌ی نه‌وت، دانوستان، له‌گه‌ڵ هێزه گه‌وره‌کانی جیهاندا بکا. چاره‌نووس و پاشه‌ڕۆژی «باشوور»، به کێشه‌ی نه‌وته‌وه ببه‌ستێته‌وه.

جا خۆ گه‌ر له‌به‌ر کێشه‌ی نه‌وت نه‌بووایه، هه‌ڵبه‌ته عه‌ره‌به‌کان، هه‌ر زۆر زوو، دانیان به «کوردستانیتیی» شاری «که‌رکووک»دا ده‌نا و پێیان له سه‌ر «عێراقیێتیی» ئه‌و شاره دا نه‌ده‌گرت! ئه‌م گرفته گه‌وره‌یه‌ش وه‌نه‌بێ، شتێکی نوێ بێ، به‌ڵکوو، هه‌ر له‌و ڕۆژه‌وه، «بریتانیا» خاکی «عێراق»ی به گشتیی و «باشووری کوردستان»ی به تایبه‌تیی داگیرکردووه، به ده‌ستی ئانقه‌ست، گرفتی «که‌رکووک»ی، له نێوان هه‌ر دوو گه‌لی سه‌ره‌کیی کورد و عه‌ره‌بدا ئه‌فراندووه. چونکه، هه‌ر له سه‌ره‌تاوه، شاری «که‌رکووک»ی، له «باشووری کوردستان» دابڕیوه و به ده‌وڵه‌تی «عێراق»ه‌وه گرێیداوه.

له‌به‌ر ئه‌وه ده‌بێ، سه‌رانی پارته‌کانی «باشووری کوردستان»، چه‌ن بایه‌خ به‌وه ده‌ده‌ن، له سه‌ر «که‌رکووک»، قسه له‌گه‌ڵ عه‌ره‌به‌کانی «عێراق»دا بکه‌ن، ده هێنده پتر، بایه‌خ به‌وه بده‌ن، له‌و باره‌یه‌وه، قسه له‌گه‌ڵ زلهێزه‌کانی جیهان به گشتیی، «ئه‌میریکا» و «بریتانیا» به تایبه‌تیی بکه‌ن، به هه‌ر شێوه‌یه بێ، ده‌میان چه‌ورکه‌ن، تا، گوشار بۆ سه‌ر عه‌ره‌به‌کانی «عێراق» و ده‌وڵه‌تی «توورکیا» به‌رن، واز له داگیرکردنی شاری «که‌رکووک» بێنن!

له هه‌موو سه‌رده‌مێکدا به گشتیی و له‌م سه‌رده‌مه‌ی ئه‌ورۆ به تایبه‌تیی، گرفتی هه‌ره گه‌وره‌ی کورد، خۆی له ناکۆکیی و دووبه‌ره‌کیی ڕیزه‌کانی گه‌لدا بینیوه و ده‌بینێ. ئه‌م گرفته، پشتی کوردی شکاندووه. بۆیه تا ئێسته، سه‌رکرده‌کانی کورد نه‌یانتوانیوه، هه‌موو مافه ڕه‌واکانی کورد به‌ده‌سبێنن! گه‌ر چاره‌سه‌رێکی بنه‌بڕیی، بۆ ئه‌و گرفته کوشنده‌یه نه‌دۆزینه‌وه، نه‌ک هه‌ر شاری «که‌رکووک» و نیوچه به‌عه‌ره‌بکراوه‌کانی دیکه‌ی «باشوور»مان له‌ده‌سده‌چێ، به‌ڵکوو، ئه‌و ده‌رده سه‌خته قێزۆناک، هێنده‌ی دیکه، جه‌سته‌ی بزووتنه‌وه‌ی کوردایه‌تی کرمه‌ڕێژده‌کا و دایده‌ڕزێنێ. ئاخر گه‌ر عه‌ره‌به‌کانیش، دان به وه‌دا بنێن، شاری «که‌رکووک»، له سه‌ر «باشووری کوردستان»ه بێ و له چوارچێوه‌ی سنووری هه‌رێمی «فیدراڵ»دا ڕێکخرێ، گه‌لی کورد نابێ، هه‌رێمێکی یه‌کگرتوو و میرییه‌کی هاوبه‌شی هه‌بێ، تا، «که‌رکووک»ی له ئامێز بگرێ؟!! جا گه‌ر که‌،، له نێو خۆدا، دوو نیوچه‌ی ده‌سه‌ڵات و دوو

داگیرکراو ڕزگارکەین. چونکە، ئەوان لە زۆر پەردەی برایەتیی و هاونایینییدا، شاری « کەرکووک » لە کورد داگیردەکەن.

4. پێویستە، بایەخێکی زۆر بە زمانی کوردیی بدەین. منداڵانی کورد، بە زمانی زکماکیی خۆیان بخوێنن. هەموو شتێ لە « کوردستان »دا بە گشتیی و لە « کەرکووک » بە تایبەتیی، بە کوردیی بنووسرێ. چونکە، بەپێی یاسای کاتیی نوێی دەوڵەتی « عێراق »یش بێ، زمانی کوردیی، لە هەموو ناوچەکانی « عێراق »دا، بە زمانێکی فەرمیی ناسراوە.

5. بایەخێکی زۆر، بە جووڵانەوەی ڕووناکبیریی بدرێ، بە تایبەتیی، مێژوو و جوگرافیای « کوردستان » بخوێنرێ و باسکرێ.

6. زۆر پێویستە، بایەخێکی تەواو، بە فاکتەری ئابووریی بدرێ. دەبێ، بازاڕی کوردەکان، بە تەواویی ببوژێنرێتەوە. ڕۆڵەکانی کورد، لە فرمانگەکانی دەوڵەتدا دامەزرێنرێن. بە هیچ شێوەیە نابێ، کوردەکانی شاری « کەرکووک » و دەوروبەرەکەی، هەژاربن و بە کولەمەرگیی بژین، وەک چەندین ساڵە، بەو شێوەیە دەژین. ئاخر چۆن دەبێ، عەرەبە هێنراوەکان، خاوەنی دەسەڵات بن و لە کارگەکانی نەوت دامەزرێن، توورکمانەکانیش، دەس بە سەر بازاڕە گرنگەکانی « کەرکووک »دا بگرن، کەچیی، ڕۆڵەکانی کوردیش، لە قەراغ شارەکان بژین و کاریان دەس نەکەوێ؟!! ئاخر، گەلێ خاوەنی ئەو هەموو نەوتە بێ، چۆن دەبێ، ڕۆڵەکانی بەو شێوەیە بژین؟!! بۆیە دەبێ، بێ کاریی، لە نێو کوردەکاندا قەلاچۆکرێ، خانوویان بۆ درووستکرێ، یا، بۆیان بکڕێ و بە هەموو شێوەیە، یارمەتییانبدرێ!

7. بە هیچ شێوەیە نابێ، سڵ لە هەڕەشەکانی دەوڵەتی « توورکیا » بکەنەوە. دەبێ، دەستی « توورک » بە تەواویی، لە « کوردستان » بە گشتیی و لە شاری « کەرکووک » بە تایبەتیی ببڕرێ. کار بە کۆمپانیا و کارگەکانیان نەسپێررێ.

8. دەبێ، کاری کتوپڕیی و ئازایانە بکرێ، بڕیاری شۆڕشگێڕانە بدرێ، هەر دەستدرێژییەک، بۆ سەر گیانی هەر کوردێ بکرێ، وەڵامبدرێتەوە، تا، کوردی « کەرکووک » هەستبکەن، پشتوپەنایان هەیە. ڕۆڵەکانی کورد بەرەڵڵا نەکرێن، بۆ ئەوەی، عەرەبە هێنراوەکان و توورکمانەکان، بە ئارەزووی خۆیان، سووکایەتییان پێ بکەن. ئاخر، گەر وا نەکەن، نەک هەر « کەرکووک »مان لەدەستدەچێ، بەڵکوو، ئابڕووی نەتەوەیی کوردیش دەچێ!

گومانی تێدا نییە، تاوانی هەرە گەورەی، مانەوەی عەرەبە جێنراوەکان لە شاری « کەرکووک » و دەوروبەرەکەیدا، لە ئەستۆی هەر دوو سەرکردایەتی « پارتیی » و « یەکێتیی »دایە. چونکە:

1. لە بەر ناکۆکیی و دووبەرەکیی، لە بەر دەسەڵات پەیداکردن لە نێو شاری « کەرکووک » بە تایبەتیی و لە هەموو « کوردستان » بە گشتیی، لە بەر پارە و کورسیی، سەر ئەوە نەپەرژاون، ئاوڕێکی کوردانە لە « کەرکووک » بدەنەوە.
2. هیچ جۆرە پلانێکی نەتەوەیی و ڕامیاریی زانستانەیان، بۆ گەڕانەوەی شاری « کەرکووک » نەبووە و نییە، تا بزانن، کاتێ ئەو شارەیان ڕزگارکرد، چی دەکەن؟ چۆن ئەو گرفتانە چارەسەردەکەن؟!!
3. مەرایی بۆ عەرەبە هێنراوەکان و توورکمانەکان دەکەن، تا ڕیزیانبگرن و بە لای خۆیاندا ڕایانکێشن، لەبری ئەوەی، باسی زۆرلێکراویی و چەوساندنەوەی کوردیان بۆ بکەن!
4. سەرکردایەتی ئەو دوو پارتە، هێندەی خۆیان بە « عێراقیی » دەزانن، هێندە خۆیان بە « کوردستانیی » نازانن. لەبەرئەوە، هەر ڕۆژەی، ناوێکی جیاواز، لە « کەرکووک » دەنێن و لە سەر بۆچوونی خۆیان سوور نین.
5. سەرەڕای ئەوەی، عەرەبە هێنراوەکان، چەندین ساڵە، زۆرداریی بەرانبەر کورد دەکەن، ئێستەش زۆربەیان، هەر لە پاشماوەکانی « بەعس »، هێزەکانی سوپا و دەزگەکانی سیخوڕیی پێکهاتوون و هەر ئەوانیشن، کاری تیرۆریستیی ئەنجامدەدەن، ئاژاوەدەنێنەوە، ڕۆڵەکانی کورد دەکوژن. لەگەڵ ئەوەشدا، نە لە سەرەتاوە و نە ئێستەش، هەر دوو پارت، هیچیان بەرانبەر نەکردوون و تۆڵەی خوێنی ئەو هەموو شەهیدانەیان لێ نەسەندوونەتەوە!
گەر سەرکردایەتی پارتەکانی « باشووری کوردستان » و میریی « عێراق »، بە تەواویی بیانەوێ، گرفتی تیرۆر و ئاژاوە، لە شاری « کەرکووک » بنەبڕکەن، بارەکە بە تەواویی هێمنکەنەوە، ئاشتیی و ئاسایش.، لە نێوان ڕۆڵەکانی شارەکەدا بچەسپێنن، ئەوا دەبێ، ئەم خاڵانەی خوارەوە ڕەچاوکەن:
1. بێ لە سەر گەڕانەوەی هەموو عەرەبە هێنراوەکانی شاری « کەرکووک » و دەوروبەرەکەی داگرن، ئەو نێوچانە چۆڵکەن و بۆ زێدی خۆیان بگەڕێنەوە. چونکە، جگە لەوەی، باڵانسی دیمۆگرافیای شارەکە تێکدەچێ، بە سەرچاوەی هەموو ئاژاوە و تیرۆرێکیش دادەنرێن. ئەمانەش، لە دوو گرووپ پێکهاتوون:
ــ ئەو عەرەبانەی لە پارتە ئیسلامییەکاندا کاردەکەن.
ــ عەرەبە کۆنە « بەعسیی »یەکان.
هەڵبەتە، هەر دوو گرووپەکەش، لە یەک دیدی شۆڤێنیستیی و داگیرکەرانەدا یەکدەگرنەوە و « کەرکووک »یش، هەر بە شاری خۆیان دەزانن.
2. دانیشتووانە ڕەسەنە دەرکراوەکانی « کەرکووک »، بۆ زێدی خۆیان بگەڕێنەوە.

3. هەموو ئەو نێوچە و شارۆچکانەی لە « کەرکووک » دابڕاون و بە هێندێ شاری دیکەوە لکێنراون، بخرێنەوە سەر پارێزگەی « کەرکووک ». بۆ نموونە: « توزخورماتوو » لە « تکریت »، « چەمچەماڵ » لە « سولەیمانیی » بکرێنەوە و بە پارێزگەی « کەرکووک »ەوە بنووسێنرێنەوە.
4. شارەکە لە ڕووی ئابوورییەوە ببوژێندرێتەوە و بێ کاریی تێدا نەهێڵرێ.
5. دەبێ، هەموو دانیشتووانی شار، بێ جیاوازیی نەتەوەیی، لە بەردەم یاسادا چوونیەکبن.
6. سەرژمێری گشتیی بکرێ، ڕێژەی ڕاستەقینەی هەر گرووپێکی ئێتنیک، لە شاری « کەرکووک » دەستنیشانکرێ، لەگەڵ سەرژمێرەکانی دیکەی پێشوو بە گشتیی و سەرژمێری ساڵی « 1957 » بە تایبەتیی بەراوردکرێ. ئینجا، ڕووی ڕاستەقینەی ژمارەی دانیشتووانی « کەرکووک » و ڕێژەی پێکهاتەی نەتەوەیی هەر گرووپێکی ئێتنیک دەردەکەوێ.
7. بە هیچ شێوەیە نابێ، لە خەڵکی شاری « کەرکووک » بپرسن، ئایا دەیانەوێ، لە سەر « باشووری کوردستان »، یا لە سەر « عێراق » بن؟ چونکە، « کەرکووک » شارێکی دێرینی « کوردستان »ە و هیچ پێویست ناکا، قوماری « ڕیفراندۆم »ی لە سەر بکرێ!
8. بە هیچ شێوەیە نابێ، دەمەتەقێ و دانوستان، لە سەر جوگرافیای پارێزگەی « کەرکووک » بکرێ. بەڵام دەکرێ، لەگەڵ گرووپە ئێتنیکەکانی دیکەدا، لە سەر کێشەکانی بەڕێوەبردن، ئابووریی و کەلتووریی، دەمەتەقێ و دانوستان بکرێ. چونکە، خاکی « کەرکووک »، موڵکی نەتەوەی کوردە و هیچ جۆرە لێکدانەوەیەک قەبووڵ ناکا!
9. باشتر وایە، سەرکردەی پارتەکان، زمانێکی هاوبەش، لەگەڵ نوێنەری کەمینە نەتەوەکانی « باشووری کوردستان » بدۆزنەوە، لەگەڵیان ڕێککەون، مافە « نەتەوەیی، ڕامیاریی و کەلتووریی »یەکانیان بۆ دابینکرێ، لە پرۆسە گرنگەکانی هەڵبژاردن و بەڕێوەبردنی شارەکەدا بەشدارکرێن. تا ئەوانیش، وەک کورد، دژی پرۆسەی بەعەرەبکردن و ڕاگوێزان بوەستن.
10. لە کاتێکدا، هەر جۆرە گرفتێکی « نەتەوەیی، ڕامیاریی، ئابووریی و کەلتووریی »، لە نێوان ڕۆڵەکانی کورد و کەمینەکاندا، لە نێوچە بەعەرەبکراوەکاندا ڕوویدا، یا گرفتێکی نەتەوەیی، لە نێوان عەرەبە هێنراوەکان و توورکمانەکاندا ڕوویدا، بە هیچ شێوەیە نابێ، لە سەر حسێبی بەرژەوەندیی نەتەوەیی کورد و خاکی « کوردستان » چارەسەرکرێ، وەک کێشەی نێوان عەرەبەکان و توورکمانەکان، لە گوندی « بەشیر »

چارەسەرکرا. چونکە، بە هەر شێوەیە بێ، دەبێ، عەرەبە هێنراوەکان بارکەن و بڕۆن، نەک لە شوێنێ بۆ شوێنێکی دیکە بیانگوێزنەوە و بە یەکجاریی بمێننەوە، لە هەموو بارێکیشدا، زەوی لە کورد داگیرکەن و پێکهاتەی دیمۆگرافیای نێوچەکانیش تێکدەن!

ستۆکهۆلم
2004. 10. 01

* * *

---

<u>تێبینییەکان</u>:

* ئاخر. گەر « کەرکووک »، لە بەر دڵی عەرەبەکانی « عێراق »، کەمینەی « توورکمان » و سەرانی « توورکیا »، شارێکی « کوردیی » نەبێ و تەنیا هەر، شارێکی « کوردستانیی » بێ، کەواتە: « بەغدا »ش، شارێکی « عەرەبیی » نییە و تەنیا هەر، شارێکی « عێراقیی »یە! هەروەها، شارەکانی « تالین، ریگە، ڤیلنووس، کییڤ، کیشینیۆڤ، باکۆ، دووشەمبە... »، چەن شارێکی ئەو گەل و نەتەوە ڕەسەنانە نین، بەڵکوو، چەن شارێکی « ئیستۆنیا، لاتڤیا، لیتڤیا، ئۆکرەینا، مەڵدۆڤە، ئازەربایجان، تاژیکستان ... »ن، هەر لەبەرئەوەی، چەن میلیۆنێ « ڕووس »یان تێدا دەژی و دڵی ئاسکیان، گەردی لێ نەنیشێ!!!

1* ئەو زاراوە نیشتیکانەی، پارت و دەزگەکانی ڕاگەیاندنی « کوردستان »، لە ئاخاوتن و نووسینەکانیاندا بەکاریدێنن، زۆر هەڵەن و لە پاشەڕۆژدا، زیان بە کێشەی کورد دەگەیەنن. ئاخر، شتێکی زۆر سەیرە، هەر دوو کەناڵی ئاسمانیی « **Kurdistantv** » و « **Kurdsat** »، بێ ئەوە بزانن، چی دەڵێن، هەروا بە شێوەیەکی هەرەمەکیی و زۆر ئاشـــــارەزایانە، زاراوەی « نەتەوەکانی کەرکووک » بەکاردێنن. لە کاتێکدا، لە هەموو « باشـــــووری کوردستان » و « عێراق »یشدا، یەک نەتەوەی تێدا نییە، بەڵکوو، کۆمەڵگەی « عێراق »، لە دوو گەلی سەرەکیی « عەرەب » و « کورد »، چەن کەمینەیەکی نەتەوەیی وەک: « توورکمان، ئاشوور، ئەرمەن و کلدان » پێکهاتووە. بەڵام، لەگەڵ ئەوەشدا، گەلی عەرەب لە « عێراق »، بە بەشێ لە نەتەوەی عەرەب، گەلی کوردیش لە « باشووری کوردستان »، بە بەشێ لە نەتەوەی کورد دەژمێررێن. ئەو کەمینە نەتەوەییانەش، گەل و نەتەوە نین. چونکە، یەکێ لە مەرجە هەرە گرنگەکانی گەل و نەتەوەیان تێدا نییە، ئەویش خۆی لە « خاک »دا دەبینێ. واتە: خاوەنی هەرێمێکی دیاریکراوی جوگرافیایی نین، تا، لەسەری بژین و هەموو ڕۆڵەکانی خۆیانی، لە سەر کۆکەنەوە. بەڵکوو، ئەوەتەی هەن، بڵاوبوونەتەوە و لە یەک جێیدا ناژین! بۆیە، باشتر وایە، بنووسین و بڵێین: دانیشتووانی شاری « کەرکووک »، یا خەڵکی « کەرکووک »، یا کۆمەڵگەی « کەرکووک »، یا گرووپە نیشتیکەکانی « کەرکووک »، یا ڕۆڵەکانی کورد لە « کەرکووک ».

ئەم زاراوە خراپ و پڕ لە هەڵەیەش، ئەندامانی « یەکێتی نیشتمانیی کوردستان »، لە دووەمین کۆنگرەی خۆیاندا دایانتاشی و بڕیاریان لە سەر دا. توورکمانەکانیان، لە کەمینەوە بۆ گەل بەرزکردەوە، وەک ئەوەی، کێشەی کەمینە و گەل، کێشەی موەجەی فرمانبەران بێ، بە بڕیارێکی پارت یا دەسەڵات بگۆڕرێ! ئاخر، کەمینەیەک لە بنەڕەتدا، خاکی نەبوو، بە بڕیارێکی کۆنگرە، بۆی پەیدادەکرێ؟!! ئەمەشیان، تەنیا هەر لەبەرئەوە کرد، تا، لە سەر حسێبی ماڵی کورد، هەست و سۆزی کەمینەی توورکمان، بە لای خۆیاندا ڕاکێشن. بەڵام، هەر ئەو سەرکردانەی « یەکێتیی » خۆیان، هیچ جۆرە لێکدانەوەیەکیان، بۆ بیست ملیۆن کوردی « باکووری کوردستان » نەکردووە، کە سەرانی دەوڵەتی داگیرکەری « توورکیا »، نەک هەر دان بە بوونی کورددا نانێن، بەڵکوو، دان بە خاکی « کوردستان »یشدا نانێن! ئەدی، ئەوان بۆچی، هیچ جۆرە لێکدانەوەیەک، بۆ هەست و سۆزی ئەو بیست ملیۆن کوردە ناکەن؟!!

بەڵێ، سەرانی کورد، هێندە دەس و دڵ ئاواڵەن، کەچیی، توورکمانەکانیش، لە هیچ شوێنێکی ئەم جیهانەدا، نەک هەر دان بە بوونی نەتەوەی کورد و خاکی « کوردستان »دا نانێن، بەڵکوو، دان بە دەسەڵاتی میریی هەرێمی « باشووری کوردستان » و سیستێمی « فیدراڵ »یشدا نانێن! لە ڕاستییدا، تەنیا هەر عەرەبەکانی « عێراق »، گەلێ ڕاستتر و باشتر، بۆ ئەو باسە گرنگە چوون و هەمیشەش دەڵێن: « عێراق »، لە دوو گەلی سەرەکیی و چەن کەمینەیەک پێکهاتووە.

سەرچاوە :

1. الاتحاد الاسلامي لتركمان العراق، شهداء التركمان، الجزء الاول، الطبعه الاولى، دار الدليل للصحافه و النشر، 1999.

# دەربارەی یاسای کاتیی، بەڕێوەبردنی دەوڵەتی عێراق .

لە ڕاستییدا ناکرێ، بڵێین، ئەو یاسایە، هەر هەموو خاڵەکانی خراپن و هیچ جۆرە شتێکی باشی، بۆ کورد تێدا نییە. هەرچەندە، بە شێوەیەکی گشتیی، چ بە عەرەبیی و چ بە کوردیی، لە سەر یاساکە نووسراوە، بەڵام، ئەز لێرەدا، هێندەی پێوەندیی، بە خاڵە خراپ و کێشە چارەنووسسازەکانی گەلی کوردەوە هەبێ، لە دوو بڕگەی سەرەکیی یاساکە دەدوێم. چونکە، پێم وایە، زیانێکی زۆر، بە کێشەی کورد دەگەیەنن. جا با بزانین، دەربارەی کێشەی « کەرکووک »، چی لەو دوو بڕگەیەدا هاتووە؟

لە بڕگەی « 16 »، خاڵی « ج »دا نووسراوە: (هاووڵاتی عێراق، مافی تەواو و بێ مەرجی موڵکدارێتی لە هەموو عێراق دا هەیە، بێ هیچ جۆرە بەربەستێ!)«1»

ئەمە، ئەوە دەگەیەنێ، لە لایەکەوە نەیانەوێ، عەرەبە هێنراوەکانی پارێزگەی « کەرکووک » بگێڕنەوە و ڕێیانبدەن، بمێننەوە، هەر وەک چۆن هەوڵدەدەن، عەرەبە خێڵەکییەکانی گوندی « بەشیر »، لە جێیەکی دیکەی « کوردستان » نیشتەجێکەن. لە لایەکی دیکەشەوە، گەر لە پاشەڕۆژدا، دەوڵەمەندەکانی عەرەب بیانەوێ، بە ئارەزووی دڵی خۆیان، لە هەر شوێنێکی « کوردستان »، زەوی بکڕن، یا، خێڵێکی تەواوی عەرەب بێن، نێوچەیەکی بە پیت و خاوەن نەوت بکڕن، ڕێیان لێ نەگیرێ، بەڵکوو، میریی « عێراق »یش، یارمەتییانبدا! ئاخر، ئەمە لە چ دەوڵەتێکی فرەنەتەوە و نیشتماندا هەبووە، کە گرفتێکی زۆر، لە نێوان گرووپە ئێتنیکەکاندا، لە سەر خاک هەبووبێ؟!!

بۆ نموونە: « یەکێتی سۆڤێت »، دەوڵەتێکی فرەنەتەوە و نیشتمانی گەورەی « کۆمۆنیستیی » بوو، هەر باوەڕی بە باس و خواستی نەتەوایەتییش نەبوو، کەچیی، لەگەڵ ئەوەشدا، سنووری هەموو کۆمارە فیدراڵەکان دیارییکرابوو،

خەڵکی هیچ کۆمارێ، بۆی نەبوو، بە ئارەزووی خۆی، بۆ کۆمارێکی دیکە بگوێزرێتەوە، مەگەر، بە هۆی پڕۆسەی جووتبوون، یا، کاری فرمانبەرییەوە بووایە، ئەویش، دەردی سەرییەکی زۆری دەویست!
لەبەرئەوە، ئەز پێم وایە، هەر کوردێ، یەک بستە زەوی خۆی، بە هەر عەرەبێ یا توورکمانێ بفرۆشێ، ناپاکییەکی کەڵێ کەورە، لە خوێنی شەهیدان و خاکی « کوردستان » دەکا. هەقیش وایە، ئەوەی ئەو کارە بکا، لێی بێ دەنگ نەبن، بەڵکوو، بەربارانکرێ و لە « کوردستان »یش شاربەدەرکرێ!
هەروەها، بڕگەی « 53 »ش، لە سێ خاڵی گرنگ پێکهاتووە. لە خاڵی « ب »دا نووســــراوە: (سنووری « 18 » پارێزگەکە، لە ماوەی گواستنەوەدا، بێ گۆڕانکاریی دەمێنێتەوە.)«2» واتە: نابێ، لە پارێزگەی « کەرکووک »، هیچ جۆرە گۆڕانکارییەک بکرێ، نێوچە دابڕاوەکانی بۆ بگەڕێتەوە.
لە خاڵی « ج »یشدا هاتووە: (پارێزگەکانی دەرەوەی هەرێمی « کوردستان » بۆیان هەیە، لە نێوان خۆیانـــــــدا، هەرێم دامەزرێنن، جگە لە « بەغدا » و « کەرکووک ».)«3» واتە: پارێزگەی « کەرکووک » لە « باشووری کوردستان » و نێوچەی « فیدراڵ »، بارێکی تایبەتیی هەیە، نابێ، دەســـکارییبکرێ و بە « کوردستان » دانانرێ!
سەیر ئەوەیە، چەندین ساڵە، هەر دوو سەرکردە « بارزانیی » و « تاڵەبانیی »، شاری « کەرکووک »، بە « دڵ » و بە « قودس » دادەنێن، کەچیی، هەر دووکیان، ئەو چەن بڕگە بێ ناوەڕۆکە هیچوپووچەیان واژووکردووە، ئەو بڕگە زەقانەی، بە هیچ جۆرێ، دان بە « کوردستانێتیی » شاری « کەرکووک »دا نانێن، بێ ئەوەی، کەس زۆری لێ کردبن! ئیدی، قووڕی چی بۆ « کەرکووک » دەپێون، گەر خۆیان پێشەکیی، بڕیاریاندابێ، لە سەر « کوردستان » نەبێ؟!!
بەڵام، گەر ئێستە، هاوار بۆ « کەرکووک » دەکەن، ئەوا، پێم وایە، وەک هۆیەک بۆ هەڵبـــژاردنی داهاتوو، بۆ بەرژەوەندیی تەسکی پارتایەتیی خـــۆیان بەکاریدێنن!
بۆیە دەبێ، ڕۆڵەکانی گەلی کورد هوشیاربن، لە کاتی دەنگدان لە سەر دەستووری هەمیشەیی « عیراق » وریابن، هەڵەی ئەو دوو سەرکردەیە دووبارە نەکەنەوە. بەڵکوو، ئەوانیش دەبێ، ئەو هەڵە مێژووییەی خۆیان ڕاستکەنەوە، شتێ لەو بابەتانە بۆ عەرەبەکان واژوو نەکەن و پێ لە سەر « کوردستانێتیی » شاری « کەرکووک » داگرن!

ستۆکهۆڵم
2005. 10. 02

تێبینییەکان:

1. للمواطن العراقی الحق الکامل غیر المشروط بالتملک فی کافه انحاء العراق بلا قیود.
2. تبقی حدود المحافظات الثمانیەعشر بدون تبدیل خلال المرحله الانتقالیه.
3. یحق للمحافظات خارج اقلیم کردستان، فیما عدی بغداد و کرکوک، تشکیل اقالیم فیما بینها.

# « کەرکووک » و « برۆکسل »

ماوەی چەن مانگێ دەبێ، « جەلال تاڵەبانیی »، شاری « کەرکووک »ی کورد و « قودس »ی « کوردستان »، بە شاری « برۆکسل »ی پێتەختی « بەلچیکا » دەچوێنێ، بێ ئەوەی، هیچ جۆرە جیاوازیی و بارێکی نەتەوەیی، هەر دوو شارەکەی ڕەچاوکردبێ. لەبەرئەوە، لێرەدا بە پێویستی دەزانم، هەموو ئەو جیاوازییانەی، لە نێوان ئەو دوو شارەدا هەیە، بۆ ئەویش و ڕۆڵەکانی نەتەوەی کوردیشی ڕوونکەمەوە.

1. لە نێو شاری « برۆکسل »دا، دوو گرووپی ئیتنیکی سەرەکیی « فلامۆن » و « فالۆن » هەیە. یەکەمیان لە « 57% » و دووەمیشیان، لە « 33% »ی دانیشتووانی وڵاتەکە پێکدێن. یەکەمیان بە زمانی « فلامۆنیی » و دووەمیشیان، بە زمانی « فرەنسیی » قسەدەکەن. لە « 10% »ەکەی دیکەشی، لە دوو گرووپی ئیتنیکی بچووک پێکهاتوون، بە هەر دوو زمانی « ئیتالیی » و « ئەڵمانیی » دەدوێن. لە نێوان ئەم دوو گرووپەدا، نزیکەی هیچ جۆرە گرفتێکی جوگرافیایی و نەتەوەیی نییە. بەڵکوو، گرفتەکەی نێوانیان، پتر خۆی لە کێشەی ئابووریدا دەبینێ. چونکە، زۆربەی نێوچەی « فالۆن »ەکان، دواکەوتووتر و هەژارترن. بەڵام، شاری « کەرکووک »، جگە لە گرفتی جوگرافیا، گەورەترین گرفتی نەتەوەیی و دیمۆگرافیای هەیە.

2. ئەو دوو گرووپەی « برۆکسل »، هەر لە کۆنەوە، پێکەوە دەژین و خاکەکە بە هی هەر دووکیان دەژمێررێ. بەڵام، لە شاری « کەرکووک »، ڕۆڵەکانی کەسێنەی توورکمان، نزیکەی سێسەد ساڵێ دەبێ، لەوێ دەژین. لە ڕێی ئیمپراتۆریای « توورکە عوسمانیی »یەکانەوە هاتوون و نیشتەجێکراون. هەروەها عەرەبەکانیش، لە نێوان ساڵەکانی بیست و سی سەدەی بیستەوە، لە دەوروبەری شاری « کەرکووک » جێگیربوون. پاشان، لە سەرەتای شەستەکانیشەوە، پرۆسەی بەعەرەبکردنی پارێزگەی « کەرکووک » دەستپێکردووە و تا ڕژێمی « بەعس »یش ڕووخاوە، هەر بەردەوامبووە.

واتە: ئەرچی توورکمانەکان، لە کۆنەوە لە « کوردستان » ژیاون، بەڵام، هەر دووکیان: « عەرەب و توورکمان »، خەڵکی نێوچەکە نین و دەستەڵاتە جیاوازەکانی ئەو سەردەمانە هێناویانن و نیشتەجێیانکردوون.
3. عەرەبەکان لە شاری « کەرکووک »، خۆیان بە هاووڵاتی پلە یەک، کورد و توورکمانیش، بە هاووڵاتی پلە دوو یا سێ دادەنێن. بەڵام، لە « برۆکسل »، هاووڵاتی پلە یەک و دوو نییە، هەموویان وەک یەک دەژین و لە بەردەم یاسادا، بە یەک چاو تەماشادەکرێن!
4. ئەو دوو گرووپە ئێتنیکەی « برۆکسل »، ڕقیان لە یەکدی نییە و دژی یەکدی نین، زۆربەشیان، هەر دوو زمانی یەکدی « فلامۆنیی » و « فرەنسیی » دەزانن. بەڵام، هەموو گرووپە ئێتنیکەکانی نێو شاری « کەرکووک »، چارەی یەکدییان ناوێ و گەلێ جاریش، بە خوێنی سەری یەکدی تینوون!
5. لە شاری « برۆکسل »، دیمۆکراسیی ڕەسەن و ڕاستەقینە هەیە. بەڵام، نەک هەر لە « کەرکووک » و « عێراق »، بەڵکوو، لە هەموو وڵاتانی عەرەب و ئیسلامیشدا، دیمۆکراسیی کاڵتەقینەش نییە!
6. جیاوازییەکی گەلێ گەورەی « شارستانیی، کەلتووریی، کۆمەڵایەتیی، ئایینیی، ڕامیاریی و نەتەوەیی »، لە نێوان دانیشتووانی هەر دوو شاری « برۆکسل » و « کەرکووک »دا هەیە.
7. ئەو ئەزموونەی لە « برۆکسل »دا هەیە، بە هیچ شێوەیە ناکرێ، لە شاری « کەرکووک » تاقیکرێتەوە. چونکە، جگە لە کورد، گرووپە ئێتنیکەکانی دیکە، هەر یەکەیان دەوڵەتێکی بیانیی دەیانجوڵێنێ. بۆ نموونە: توورکمانەکان بە دەوڵەتی داگیرکەری « توورکیا »وە گرێدراون. « عەرەبەکان، بە « عێراق » و تا ئەندازەیەکیش بە « سووریا »وە بەسراونەتەوە. هەر دوو گرووپەکەش، بێ قایلبوونی ئەو دەوڵەتە داگیرکەرانەی « کوردستان » ناتوانن، هیچ جۆرە بڕیارێبدەن! بەڵام، لە شاری « برۆکسل »، هیچ دەوڵەتێ نییە، ئەو دوو گرووپە ئێتنیکە بجوڵێنێ، ئەوانیش لەو ئاستە نزمەدا نین، گوێ لە بڕیار و ڕێنمایی دەوڵەتانی دەرەوە بگرن!
8. هەموو پانتایی خاکی دەوڵەتی « بەلجیکا » = 500 .30 کیلۆمەتری چوارگۆشە. کەچیی، هەر تەنیا، پانتایی خاکی پارێزگەی « کەرکووک »، پتر لە « 000 .20 » کیلۆمەتری چوارگۆشە دەبێ و لە لایەن عەرەبەکانەوە زەوتکراوە، ئیدی چۆن دەکرێ، بەراوردی ئەو دوو شارە بکرێ؟!!
9. هەموو دانیشتووانی « بەلجیک » بە گشتیی و شاری « برۆکسل » بە تایبەتیی، یەک ئایینی « فەلە » و یەک ئایینزای « کاسۆلیک » کۆیاندەکاتەوە.

دەژیان و پشتاوپشتیشیان، هەر لەو شوێنانە لەدایکبوون. تەنانەت، تێیاندا هەبوو، لە ژیانیاندا، خاکی « ڕووسیا »یان نەدیبوو، یا بە ڕەگەزیش « ڕووس » بن!
بێ گومان، ئەوانەی خۆیان باریانکرد و گەڕانەوە، ڕۆیین و نەگەڕانەوە. بەڵام، ئەوانەی مانەوە، هەر وا لەو وڵاتانە نیشتەجێبوون و تا ئێستەش، بۆ خۆیان دەژین. لەگەڵ ئەوەشدا، هیچ « ڕووس »ێ نەیگوتووە و ناشڵێ، ئەو وڵاتانە، خاکی « ڕووسیا »یە، یا، خاکی « ڕووس »ەکانە، بەڵکوو، تەنیا هەر بە زێدی خۆیانی دەزانن! جگە لەوەی، کەس غەدریان لێ ناکا، بە زمانی « ڕووسیی » دەپەیڤن، تەنانەت، شانازییش بە زێد و نیشتمانە ڕەسەنەکەی خۆشیانەوە دەکەن! کەچیی، خاکەکە بە خاکی ئەو گەلانە دادەنرێ، کە « ڕووس »ەکانیان لەگەڵدا دەژین، دەسەڵاتی ڕامیاریی و دەوڵەتیش، هەر بە دەس ئەو گەلانە خۆیانەوەیە، « ڕووس »ەکانیش، لە بازاڕ و بەڕێوەبەرێتییەکانی دەوڵەتدا کاردەکەن و دەژین. وەک: کۆمارەکانی « ئیستۆنیا، لاتڤیا، لیتڤیا، مەڵدۆڤە، ئۆکرەین، ئوزبێکستان، کیرگیزستان، تاژیکستان ... »
ئایا دەکرێ، نموونەی « برۆکسل »، لەو کۆمارانەی « یەکێتی سۆڤیێت »ی پێشوو تاقیبکرێتەوە؟!! ئاخر چۆن دەبێ، ماوەیە کەلە خاوەن خاکەکان و ماوەیەکیش، کەمە نەتەوەیی « ڕووس »، لەو دەوڵەتە نوێیانەدا، دەسەڵاتدارێن و فرمانڕەوایی دەوڵەتەکان بکەن؟!! نە هەرگیز شتی وا بووە، نە هەرگیزا و هەرگیزیش، هیچ گەلێ ئەوە قەبووڵدەکا!!! *

**ستۆکهۆلم**
**2005. 10. 03**

* * *

---

تێبینی:
* ئەم سێ گوتارەی دوایی، بۆ ئەو کۆڕە ئامادەکرابوو، کە ڕۆژی « 2004. 09. 03 »، لەگەڵ دوکتۆر « جەبار قادر »، لە بەرنامەی - « Pevajo » لە « Rojtv » پێشکەشکرا. بەڵام، بە داخێکی گرانەوە نەمتوانی، شتێکی ئەوتۆی لێ باسکەم، چونکە بەڕێوەبەری بەرنامە « حەسەنی قازیی »، بەرنامەی خۆی هەبوو، پێش ئەوەی، ئێمە بکەوین، پرسیارەکانی داڕشتبوو، نەدەکرا، لێی لادەین. لەبەرئەوە، بە پێویستم زانی، بە سێ گوتاری جیاجیا بڵاویانکەمەوە!
*1 بۆ نووسینی ئەم گوتارە، کەڵک لەم سەرچاوەیە وەرگیراوە:
**Bonniers lilla uppslagsbok, 1989.**

# « ڕێفراندۆم » و « هەڵبژاردن »

گومانی تێدا نییە، پێوەندییەکی بەهێز، لە نێوان هەر دوو زاراوەی ڕامیاریی « ڕیفراندۆم » و هەڵبژاردندا هەیە. چونکە، لە هەر دوو پرۆسەکەدا، بەپێی چەن مەرجێکی دیارییکراو، زۆربەی ڕۆڵەکانی گەل، بەشداریی تێدا دەکەن و لە کەشێکی دیمۆکراسیی و ئازاددا، پرۆسەکان بەڕێوەدەچن. بەڵام، هەر یەکەیان، ئامانجێکی جیاوازیان هەیە و بۆ مەبەستێکی تایبەتیی ئەنجام دەدرێن. بۆ نموونە: « ڕیفراندۆم »، بۆ بەلاداخستنی گرفتێکی چارەنووسساز سازدەکرێ، وەک ئەوەی، گەلێکی دیارییکراو بیەوێ، بڕیار لە سەر مافی چارەنووسی خۆی بدا، سیستێمێکی کۆن گۆڕکا و یەکێکی دیکەی نوێ هەلبژێرێ، لە بەرەیەکی سەربازیی گەورەدا بەشداربیبکا، درووشم، ئاڵا یا دراوی دەوڵەتەکەی خۆی بگۆڕێ ... تاد.

بەڵام، پرۆسەی هەڵبژاردن، هەر بە ناوەکەی خۆیدا دیارە، ڕۆڵەکانی گەلێکی دیارییکراو دەیانەوێ، سەرۆک و ئەندامانی دەزگە جیاجیاکانی « شارەوانیی، میریی و پەرلەمان » هەڵبژێرن، بۆ ئەوەی، هەموو کارە نێوەکیی و دەرەکییەکانی دەوڵەتەکە، بە شێوەیەکی ڕێکوپێک بەڕێوەبەرن.

دەکرێ، هەر دوو پرۆسەکە، لە نێو گەلێکی دیارییکراودا ئەنجامبدرێ، بێ ئەوەی، هیچیان کارێکی خراپ، لەوی دیکەیان بکەن، تا، هەموو ئەو کێشە گرنگانەی هەیانە، بەلادابخرێ. بۆ نموونە: ڕۆڵەکانی گەلی کورد دەتوانن، « ڕیفراندۆم »ێکی ئازادانە بەئەنجامبگەیەنن، تا، کێشەی چارەنووسی کورد و ئایندەی « باشووری کوردستان »، لەگەڵ « عێراق »دا یەکلاییکەنەوە. لە هەمان کاتیشدا دەتوانرێ، هەڵبژاردنێکی گشتیی، بۆ دەزگەکانی شارەوانیی پارێزگەکان و پەرلەمانی « کوردستان » سازکرێ.

هەروەها دەکرێ، هەر دوو پرۆسەکە، لە دەوڵەتێکی فرە نەتەوە و نیشتماندا، لە یەک کاتدا ئەنجامبدرێ. بۆ نموونە: گەر دەوڵەتی « عێراق » بگرین، گەلە جیاوازەکان، لە نیشتمانە جیاجیاکانی خۆیاندا، یا خەڵکی هەرێمە جیاوازەکان دەتوانن، « ریفراندۆم »ێکی ئازادانە، لە سەر ئایندەی هەرێمەکانیان سازکەن. لە هەمان کاتیشدا دەکرێ، هەڵبژاردنی تایبەتیی، بۆ نێوچە و هەرێمەکانی خۆیان بکەن و لە هەڵبژاردنی گشتیی سەرانسەریی « عێراق »یشدا، بەشدارییبکەن. ئەمەش لە کاتێکدا دەکرێ، کە هەموو کێشە سەرەکیی و گرفتە گەورەکانی ئەو گەل و هەرێمانە، بە تەواویی چارەسەرکرا بێ. « عێراق »، بە ڕاستیی، دەوڵەتێکی فرە نەتەوە و نیشتمان بێ، لە دەستووری هەمیشەیی دەوڵەتدا، دان بە هەموو مافە ڕەواکانی گەلە جیاوازەکاندا نرابێ، سنووری هەرێمەکان دەسنیشانکرابێ، مەترسیی پەلاماردان، جینۆساید و پێکەوەلکاندنی بە زۆر، لە ئارادا نەبێ!

بەڵام، با سەرنجێکی سەرپێیی، لە باری نەتەوەیی گەلی کورد و ڕەوشی ڕامیاریی « باشووری کوردستان » بدەین، تا بزانین، ئایا، هەموو کێشە و گرفتەکانی کورد، لەو بەشەی « کوردستان »دا چارەسەرکراوە؟!! ئەو غەدرە گەورە مێژووییەی، هەشتا ساڵە لە گەلی کورد دەکرێ، بنەبڕکراوە؟!! داگیرکردنی « کوردستان »، شوێنەواری بەعەرەبکردن و کۆچپێکردن، بە تەواویی سڕاونەتەوە؟!!

هەڵبەتە، هەموو کوردێکی نیشتمانپەروەر، هەموو عەرەبێکی خاوەن ویژدان و مرۆڤپەروەر، دان بەو ڕاستییەدا دەنێ، تا ئەورۆ، شتێکی ئەوتۆ نەکراوە، کە بە تەواویی، ئەو کارە دڕندانانەیی « بەعس »ی فاشیی و سەرانی دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق » بسڕێتەوە. لەبەرئەوە، لێرەدا، پرسیارێ خۆی قووت دەکاتەوە: ئایا، لەم قۆناغە ناسکەی گەلی کورد و دەوڵەتی « عێراق »ی پێدا تێپەڕدەبێ، کام پرۆسەیەیان، بۆ ئایندەی کورد پێویسترە و دەبێ، لە پێشدا ئەنجامبدرێ؟!! ئایا، بە پلەی یەکەم، بایەخ بە پرۆسەی « ریفراندۆم »ی « باشووری کوردستان »، یا بە هەڵبژاردنی گشتیی « عێراق » بدرێ؟!!

هەموو مرۆڤێکی ژیر، لە وەڵامدا دەڵێ: دەبێ، پرۆسەی « ریفراندۆم »، پێش هەڵبژاردنی گشتیی « عێراق » بکرێ. چونکە پێشەکیی دەبێ، ڕۆڵەکانی گەلی کورد، بڕیار لە سەر ئەوە بدەن، ئایا، لە چوارچێوەی ئەو دەوڵەتەدا دەمێننەوە، یا دەیانەوێ، دەوڵەتی نەتەوەیی خۆیان دادەمەزرێنن؟!! واتە: دەبێ، ڕۆڵەکانی کورد، پاشەڕۆژی نەتەوەیی و ڕامیاریی خۆیان، بە تەواویی دەسنیشانکەن، بڕیاری سەربەخۆیی تەواو و دامەزراندنی دەوڵەتێکی « کوردستانیی » بدەن،

یا، مانەوە لە چوارچێوەی دەوڵەتی « عێراق »دا پەسەندکەن. کەواتە: چ پێویستدەکا، تا پرۆسەی « ریفراندۆم » بەرێوە نەچێ، ڕۆڵەکانی کورد، بەشداریی لە هەڵبژاردنی « عێراق »دا بکەن؟!! ئاخر، بەشداریی لە هەڵبژاردنی کام دەوڵەتدا دەکەن؟!! ئەو دەوڵەتەی تا ئێستەش، دان بە مافە ڕەواکانی گەلی کورددا نانێ! بەشداریی لە کام هەڵبژاردندا دەکەن؟!! ئەو هەڵبژاردنەوەی، پتر کۆتوپێوەندیی دیلێتیی، لە دەس و پێیی ڕۆڵەکانی گەلی کوردەوە دەئاڵێنێ؟! کێ هەڵدەبژێرن؟!! ئەو سەرکردە عەرەبە شۆڤێنیستانەی هەر لە ئێستەوە، هەڕەشەی جینۆسایید لە کورد دەکەن!

سەیر ئەوەیە، بزووتنەوەی « بەرەو ریفراندۆم » لە « باشووری کوردستان »، تا ئێستە، بە شێوەیەکی فەرمیی و بە ڕاشکاویی، هەڵوێستی خۆیان، بەرانبەر بە پرۆسەی هەڵبژاردنی دەزگەکانی دەوڵەتی « عێراق » دەر نەبڕیوە! لەوە دەچێ، بێ دەنگیی، مایەی قایلبوونیان بێ! چونکە، هەر دوو پارتی دەسەڵاتدار و زلهێز، بە دڵ و بە گیان، بۆ سەرکەوتنی هەڵبژاردنەکە دەکۆشن، هەر لە ئێستەشەوە، پروپاگەندەی بۆ دەکەن و کۆمیتەی هەڵبژاردنیان، لە نێوەوە و لە دەرەوەی وڵات درووستکردووە، تا بە شێوەیەکی باش، بەشداریی لە پرۆسەی هەڵبژاردنی گشتیی « عێراق »دا بکەن. ئاخر، چۆن دەبێ، یەکێ ئەندامی بزووتنەوەی « ریفراندۆم » بێ، لە هەڵبژاردنی دەزگەکانی دەوڵەتی « عێراق »دا بەشدارییبکا؟!! کەواتە، چ پێویست بە بزووتنەوەی « ریفراندۆم » دەکا؟!! بەڵگەی بوونی چییە؟!! ئەمە خۆی لە خۆیدا، چەن خاڵێکمان بۆ ڕووندەکاتەوە:

1. ئەو بزووتنەوەیە، هەر لە سەرەتاوە، بزووتنەوەیەکی سەربەخۆ نەبووە.

2. بزووتنەوەی « ریفراندۆم »، بۆ مەبەستی گوشارخستنە سەر دەوڵەتی « عێراق » درووستبووە، تا، دان بە سیستێمی « فیدراڵیی »دا بنێ، نەک لە نێوان مانەوە و جیابوونەوە لە « عێراق »، کۆمەڵانی خەڵکی کورد سەرپشککا! بۆ نموونە: وەک چۆن، « ریفراندۆم »ی ساڵی « 1925 »ی « کۆمەڵەی گەلان »، لە نێوان هەر دوو دەوڵەتی داگیرکەری « توورکیا » و « عێراق »دا، لە نێوان دوو شتی خراپدا، ڕۆڵەکانی گەلی کوردیان سەرپشککرد، یەکێکیان هەڵبژێرن، بێ ئەوەی، مافی ئەوەیان دابنێ، دەنگ بۆ سەربەخۆیی و دامەزراندنی دەوڵەتێکی « کوردستانیی » بدەن!

3. لێپرسراوانی بزووتنەوەی « ریفراندۆم »، یاریی بە هەست و هۆشی، ڕۆڵەکانی گەلی کورد دەکەن. چونکە بزووتنەوەکە، تەنیا گەمەیەکی ڕامیاریی نەبێ، هیچی دیکە نییە!

لەبەرئەوە، گەر ڕۆڵەکانی گەلی کورد لە « باشووری کوردستان »، لە نێوان هەڵبژاردنی گشتیی دەزگەکانی دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق » و پڕۆسەی « ڕیفراندۆم »دا سەرپشککردن، گومانی تێدا نییە، دەبێ، بەشداریی لە هەڵبژاردندا نەکەن و هەوڵ بۆ جێبەجێکردنی پڕۆسەی « ڕیفراندۆم »ێکی دێمۆکراسیی و ئازاد بدەن، تا، بە شێوەیەکی بنەبڕیی، کێشەی کورد، لە نێوان مانەوە لە نێو سنووری چوارچێوەی دەوڵەتی « عێراق » و دامەزراندنی دەوڵەتێکی ناسیۆنالی سەربەخۆی « کوردستانیی »دا یەکلاییکەنەوە.
جارێکی دیکەش دووبارەیدەکەمەوە، پڕۆسەی « ڕیفراندۆم »، لە پێش هەڵبژاردنی دەزگەکانی دەوڵەتی « عێراق »ەوە دێ. بەڵام، گەر لە بەر هەر هۆیەک بێ، ڕێ نەدرێ، پڕۆسەی « ڕیفراندۆم » لە « باشووری کوردستان » بەڕێوەبچێ، یا، هەر وەک چۆن، سەرکردایەتی « پارتیی » و « یەکێتیی »، هەر لە ئێستەوە، دەهەوڵ بۆ هەڵبژاردنی « عێراق » دەکوتن، بێ ئەوەی، هیچ جۆرە مافێکی نەتەوەیی و ڕامیاریی گەلی کورد، بە تەواویی دانی پێدا نرابێ، چارەنووسی ئەو نێوچانەی، لە ژێر باری بەعەرەبکردندا ماونەتەوە، بە لایەکدا خرابێ، ئەوا، پێویست ناکا، ڕۆڵەکانی گەلی کورد، بەشداریی لەو هەڵبژاردنەدا بکەن!
هەڵبەتە، پڕۆسەی « ڕیفراندۆم »، هەر وا کارێکی ئاسان نییە، جگە لەوەی، لە نێوخۆی گەلەکەی خۆماندا، کارێکی زۆر و خۆ ئامادەکردنێکی باشی دەوێ، دەبێ، لە هەمان کاتیشدا، حسێب بۆ دوژمنەکانی نێوخۆ، نێوچەکە و جیهانیش بکرێ.
چونکە، شتێکی ئاشکرایە، هیچ پارتێکی عەرەبیی و سەرانی دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق »، هەرگیز بەوە قایل نابن، ڕۆڵەکانی گەلی کورد، دەنگ بۆ سەربەخۆیی تەواوی « کوردستان » بدەن. هەروەها، هیچ دەوڵەتێکی دیکەی داگیرکەری « کوردستان »، لەگەڵ لەتوپەتکردنی خاکی « عێراق »دا نین و دژایەتیشیدەکەن. جگە لەوەی، دوور نییە، « ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان »، هەر لە بنەڕەتدا، ئەو بیرە ڕەتکاتەوە، سەرپەرشتیی پڕۆسەی « ڕیفراندۆم » لە « باشووری کوردستان »، لە ئەستۆی خۆی بکرێ!
هەروەها، دەوڵەتە زلهێزەکانی جیهانیش، لەگەڵ دامەزراندنی دەوڵەتێکی ناسیۆنالی سەربەخۆی « کوردستانیی »دا نین، چونکە، تا ئێستە، بەرژەوەندیی ئەو دەوڵەتانە، لە « عێراق »ێکی یەکگرتووی بێ جەنگ و ئاژاوەدا خۆی دەنوێنێ. لەو بارەیەشەوە، ئەزموونی دەوڵەتێکی زلهێزی وەک « چین » و دەوڵەتۆچکەیەکی وەک « تایوان »مان لەبەرچاوە، چۆن ڕۆڵەکانی گەلی

« تایوان » دەیانەوێ، لە ڕێی « ڕیفـراندۆم »ێکی ئازادەوە، پێـوەندیی دەوڵەتەکـەیان و پاشـەڕۆژی گـەلەکـەیان، لەگـەڵ دەوڵەتی « چین »دا یەکلاییکەنەوە. کەچی، سەرکردایەتی پارتی کۆمۆنیستی « چین »، وەک پارتێکی دیکتاتۆر، نەک هەر دژی پرۆسەی « ڕیفراندۆم » وەستاوە، بەڵکوو، هەڕەشەی بەکارهێنانی هێزیشیان لێ دەکا. لە هەمان کاتیشدا دەبینین، هەر دوو دەوڵەتی زلهێزی « ئەمەریکا » و « فەرەنسە »ش، کە خۆیان بە قەڵای دیمۆکراسیی و ئازادیی دەزانن، بەرژەوەندیی نەتەوەیی و ئابووریییان، وا پێویست دەکا، دژی داواکاریی گەلی بێ چارەی « تایوان » بوەستنەوە و لەگەڵ « چین »دا، هاودەنگبن!
ئاشکرایە، دوای ئەوەی، سـەرکردەی هەر دوو پارتی گەورە: « بارزانیی » و « تالەبانیی »، لە بەدیهێنانی ئامانجەکانی گەلی کورددا سەرکەوتوو نەبوون، دانوستانێکی خراپیان، لەگەڵ کاربەدەسانی دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق »دا کرد، بەوە قایلبوون، ئێوچە بەعەرەبکراوەکان، هەر بەو شێوەیە بمێننەوە، تا هەڵبژاردن دەکرێ و میرییەکی هەڵبژێردراو دروستدەکرێ، ئەو ئێوچانە، بۆ سەر « باشووری کوردستان » نەگەڕێنەوە. هەروەها، بەوەش قایلبوون، سیستێمی « فیدراڵیی »، لەو ئێوچانەدا نەچەسپێندرێ و ڕۆڵەکانی کورد دەنگ نەدەن! وەنەبێ، ئەمەشیان لە ڕۆڵەکانی گەل شاردبێتەوە و لەو دیو پەردەی شانۆی ڕامیاریی « عێراق »ەوە کردبێتیان، بەڵکوو، زۆر بە ئاشکرا، ئەو کارەیان کردووە و بۆ « ئەنجوومەنی فەرمانڕەوایی کاتیی عێراق »یشیان واژووکردووە. چونکە، لە برگەی « 53 » خاڵی « ب و ج »دا، ئەو دەقانە، زۆر بە ڕوونیی تۆمارکراوە و هەر دوو سەرکردەی پارتی گەورەش، بە ئارەزووی خۆیان واژوویانکردووە.
ئینجا دەڵێم: دوای ئەو گوتارە شۆڤێنیستانەیەی سەرۆکی خێڵی « شەمەر » و میریی کاتیی « عێراق »، کە هەڕەشەی جەنگ و لەنێوبردنی لە کورد کردووە، گەلی کورد، دوو چەکی گەلێ گرنگ و کاریگەری بە دەسەوە ماوە، تا داواکارییە نەتەوەیی و ڕامیارییەکانی خۆی، بە سەر کاربەدەسە عەرەبەکانی « عێراق »دا بسەپێنێ. ئەویش ئەوەیە: ڕۆڵەکانی گەلی کورد و پارتەکانی، بەشداریی لە هەڵبژاردندا نەکەن، گوژمێکی بە تین بە بزووتنەوەی « ڕیفراندۆم » بدەن و هەوڵێکی تەواو، بۆ سازدانی بدەن. ئەگینا، لە بەرانبەر ئەو بۆچوونە شۆڤێنستیی و ڕەگەزپەرستانەیەی سەرانی عەرەبدا، سەرانی پارتەکانی « باشووری کوردستان »، هیچ جۆرە چەکێکی کاریگەر و گرنگیان، بەدەسەوە نەماوە، جگە لەو دوو چەکە دیمۆکراسیی و ڕەوایە نەبێ!

هەموومان دەزانین، ئەورۆ، گەلی کورد، لە مێژووی « عێراق » بە گشتیی و « باشووری کوردستان » بە تایبەتیی، بە قۆناغێکی گەلێ ناسک و ئاڵۆزدا تێدەپەڕێ. گەر ئێستە، ڕیزەکانمان یەک نەخەین، داواکاریی و ئامانجەکانمان دەستنیشان نەکەین، پێ لە سەر بەدیهێنانی مافە نەتەوەیی و ڕامیارییەکانی کورد دا نەگرین، ئەوا، ئەم هەلە مێژووییەشمان لەکیس دەچێ، هەر وەک چۆن، هەلی دوای یەکەمین جەنگی جیهانیمان لەدەست چوو! بە تایبەتیی، ئەورۆ لە هەموو ڕۆژێ زیاتر، هەموو کارتەکانی گەمەی ڕامیاریی، سەرانی دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق » ئاشکرابووە، دید و بۆچوونی سەرکردایەتی پارتە ڕامیارییەکانی عەرەب ڕوونبۆتەوە. چونکە، تا ئێستە، ئەو سەرە شۆڤێنیست و ڕەگەزپەرستانە، بە تەواویی، دانیان بە هەموو مافە ڕەواکانی گەلەکەماندا نەناوە و نیازیشیان نییە، هەرگیز، دانی پێدا بنێن، گەر گوشاری ڕامیاریی و دیپلۆماسییان لە سەر نەبێ. چونکە، ئەوەی دەیڵێن و دەینووسن، جێبەجێی ناکەن و هەر زوو لێی پەشیماندەبنەوە. جا گەر وا نییە، ئەوا پتر لە ساڵێ دەبێ، ڕژێمی « بەعس » ڕوخاوە و « سەددام » دەستگیرکراوە، کەچیی، خاڵی « 58 »یان پشتگوێخستووە و نایانەوێ، هەر باسیشی بکەن، چونکە، باش دەزانن، بە زیانی خۆیان و بە قازانجی کورد تەواودەبێ !

لە ڕاستییدا، ئەم قۆناغە پڕ لە مەترسیی و ئاڵۆزە، هەر لە ئەزموونی ساڵەکانی نێوان « 1920 - 1925 » دەچێ، کاتێ ئیمپریالیزمی « بریتانیای گەورە » و عەرەبە نۆکەرەکانیان، دەوڵەتی « عێراق »یان دامەزراند، بە بەڵێنی درۆ، بە ناوی برایەتی ئایینیی و کۆماری هاوبەشەوە، دەستی کوردیان بڕی! ئەوا پتر لە هەشتا ساڵ دەبێ، « باشووری کوردستان » بە دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق »ەوە لکێنراوە، جگە لە داگیرکردن، چەوساندنەوە، کاولکردن، تالانکردن، سووکایەتیپێکردن، کوشتن و بڕین، ئەنجامەکەی چی دیکە بووە؟!! چ جۆرە خۆشیی، ئازادیی و سەربەخۆییەکی نەتەوەییمان، لە سەرانی ئەو دەوڵەتە داگیرکەرە دیوە؟!!

لەبەرئەوە، با ئەم هەلە گەورە مێژووییە دووبارە نەکەینەوە، بەشداریی لە دەنگدانی هەڵبژاردنی دەزگەکانی دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق »دا نەکەین، وەک مافێکی ڕەوا و دیمۆکراسیی خۆمان، کەڵک لە مانگرتن و خۆپیشاندان وەرگرین، تا، هەموو مافە نەتەوەیی و ڕامیارییەکانی خۆمانیان، بە سەردا دەسەپێنین. ئێمە دەبێ، پێش ئەوەی هەوڵبدەین، ماڵی خەڵکی دیکە ئاوەدانکەینەوە، ماڵە کاولەکەی خۆمان ڕێکخەین و ئاوەدانیکەینەوە. چونکە، ئێمە پێش ئەوەی « عێراقیی » بین، خەڵکی « کوردستان »ین، گەر عەرەبەکانی

« عێراق »، ڕێز لە بوونی نەتەوەییمان نەگرن، دان بە مافە ڕەواکانماندا نەنێن، بچوکترین مافی دیموکراسییمان بۆ ڕەوا نەبینن و هەڕەشەی لەنێوبردنمان لێ بکەن، ئیدی بۆ دەبێ، خۆمان بە « عێراقیی » بزانین و ئاسنی سارد بکوتین؟!!
ئێمە کوردین و لەگەڵ گەلی عەرەبدا، جیاوازییەکی زۆرمان هەیە. چونکە، ئەوان بە هەموو جۆرە مافێکی نەتەوەیی و ڕامیاریی خۆیان گەیشتوون. بەلام، ئێمە تا ئێستە، هیچ جۆرە مافێکی نەتەوەیی و ڕامیارییمان نییە! ئەوان گرفتی تایبەتیی خۆیان هەیە و ئێمەش، بە گرفتی ژێردەستیی، نەبوونی ئازادیی، سەربەخۆیی و دەوڵەتی ناسیۆنالەوە دەناڵێنین! بۆیە دەبێ: لە « کوردستان »ەکەی خۆمانەوە دەستپێبکەین، هەر کاتێ، ماڵە وێرانەکەی خۆمان ئاوەدانکردەوە، مافە زەوتکراوەکانمان دابینکرا، نێوچە داگیرکراوەکانمان بۆ گەڕایەوە، ئەو کاتە دەتوانین، سەرە داوی دیالۆگێکی شارستانیی و دیموکراسییانەی ئازاد، لەگەڵ نوێنەرانی گەلی عەرەبی « عێراق » گرێدەین، لە سەر چەن خاڵێکی هاوبەش ڕێککەوین، زەمانێکی نێوکۆیی ڕامیاریی بدۆزینەوە، تا، ڕۆڵەکانی گەلی کوردیش، وەک ڕۆڵەکانی گەلی عەرەب، بە ئازادیی و سەربەخۆیی، لە دەوڵەتی « عێراق »ی هاوبەش و دیموکراسییدا بژین.
لەبەرئەوە، تا ئەو ئامانجانە بەدی نەیە، داوا لە هەموو ڕۆڵەکانی گەلی کوردی « باشووری کوردستان » دەکەم، بە هیچ جۆرێ، بە بانگەشەی هەڵخەڵەتێنەرانەی سەرکردایەتی هەر دوو پارتی فەرمانڕەوی « باشووری کوردستان » هەڵ نەخەڵەتێن، بەشداریی لە هەڵبژاردنەکانی « عێراق »دا نەکەن، تا، سەرانی ئەو دەوڵەتە داگیرکەرە، دان بە هەموو مافە ڕەواکانی گەلی کورددا دەنێن. ئاخر، کاتێ دەبێ، ڕۆڵەکانی گەلی کورد، لە هەڵبژاردنی « عێراق »دا بەشدارییبکەن، کە ئومێدیان بە پرۆسەی « ڕیفراندۆم » نەمابێ و لێپرسراوانی « عێراق »یش، ئەم خاڵانەی خوارەوەیان جێبەجێکردبێ:
1. هەموو ئەو نێوچانەی لە « کوردستان » دابڕاون و بە « عێراق »ەوە لکێنراون، یا، هەموو ئەو نێوچانەی، لە هەر دوو پارێزگەی « کەرکووک » و « هەولێر » کراونەتەوە و بە پارێزگەیەکی دیکەوە بەسراونەتەوە، بۆ باری ئاسایی پێش پرۆسەی بەعەرەبکردن بگێڕدرێنەوە.
2. هەموو عەرەبە هێنراوەکان، بۆ زێدی خۆیان بگەڕێنەوە.
3. هەموو کوردە دەرکراوەکان، بۆ جێی خۆیان بگەڕێنەوە.
4. قەرەبووی زیانەکانیان بکرێ.

5. دان بە سنووری جوگرافیایی سروشتیی « باشووری کوردستان »، هەر لە « زاخۆ »وە تا « خانەقین » بنێن.
6. دان بە فیدراڵیی جوگرافیایی و ڕامیارییدا بنێن.
ئەگینا، گەر وا نەبێ، نابێ، بە هیچ شێوەیە، ڕۆڵەکانی گەلی کوردی چەوساوە، بەشداریی لە هەڵبژاردندا بکەن. بەڵکوو دەبێ، تەنیا هەر ئەو کاتەی، مافە ڕەواکانیان دەستنیشاندەکرێ و دانی پێدا دەنرێ، بەشداریی بکەن. بەلام، گەر تا ئێستە، سەرانی دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق »، ئەو خاڵانەیان جێبەجێ نەکردووە، ئەوا، بەشدارییکردن لە هەڵبژاردندا، جارێکی دیکە، ڕەوایی بە دەسەلاتی « عێراق » و داگیرکردنی « باشووری کوردستان » دەداتەوە، ئەوەش خۆی لە خۆیدا، جگە لەوەی، تەمەنی دیلێتیی گەلی کورد درێژدەکاتەوە، ناپاکییەکی مێژوویی نەتەوەییش نەبێ، هیچی دیکە نییە!

ستۆکهۆلم
2004. 11. 04

* * *

---

تێبینیی :
ئەم گوتارە، تا ئێستە، سێ جار بلاوکراوەتەوە. یەکەمین جار: لە « **Kurdistanpost** »، دوومین جار: لە « **Klawrojna** » و سێیەمین جاریش: لە هەفتەنامەی « هاوڵیر »دا بوو.

# دەربارەی هەڵبژاردنەکان

کاتێ « جۆرج بوش »، ڕۆژی « 03 .11 .2004 » بۆ دووەمین جار هەڵبژێردرایەوە، « جۆن کێریی » ڕکەبەری، بە تێلیفۆن قسەی لەگەڵ کرد و پیرۆزبایی لێ کرد. بە ڕۆڵەکانی گەلەکەشی گوت: ئێمە هەموومان، خەڵکی « ئەمێریکا »ین و « ئەمێریکا »ش بەرەو پێشەوە دەڕوا. هەوڵبدەن، یارمەتیی « بوش » بدەن، تا بە هەموومان، گرفتەکانی « ئەمێریکا » چارەسەرکەین.
ئایا، گەر « بارزانیی » یا « تاڵەبانیی »، لە هەڵبژاردنی ئەم جارەدا، یەکێکیان دەرچووایە و ئەوی دیکەیان دەر نەچووایە، ئەو هەڵوێستەیان دەبوو؟!! لە وەڵامدا دەڵێم: نەخێر. چونکە، لە لایەکەوە، ئەزموونی تاڵی یەکەمین هەڵبژاردنی پەرلەمان و لە لایەکی دیکەشەوە، لیستی هاوبەشی ئەم جارەیان، ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێ، نەک هەر پیرۆزباییان لە یەکدی نەدەکرد، بەڵکوو، بە جەنگی سەرتاسەرییش، وەڵامی یەکدیان دەدایەوە!
ئاخر، تا ڕژێمی « بەعس »ی فاشیست و « سەددام حوسێن »ی دیکتاتۆری خوێنڕێژ مابوون، تا هێزەکانی هاوپەیمان بە سەرکردایەتی « ئەمێریکا »، دەسەڵات و سەروەرییان، بۆ عەرەبەکانی « عێراق » نەگێڕایەوە و بە هەموو لایەکیان بڕیاریان نەدا، هەڵبژاردنێکی گشتیی بکرێ، دەزگەکانی پەرلەمان و سەرۆک کۆمار هەڵبژێردرێن، سەرانی « پارتیی » و « یەکێتیی »، جگە لەوەی، ڕێزیان لە داواکاریی ڕۆڵەکانی گەلەکەی خۆیان نەدەگرت، دەربارەی هەڵبژاردنی نوێی پەرلەمانیش، هەمیشە، بە دەم شتێکیان دەگوت و بە کردەوەش، شتێکی دیکەیان دەکرد!
لە ڕاستییدا، ئەو دوو پارتە زلهێزە دەسەڵاتدارەی « باشووری کوردستان »، نیازی ئەوەیان نەبوو، هەڵبژاردنی نوێی پەرلەمان، لە « کوردستان »دا دووبارەکەنەوە. بەڵکوو، گەر بۆیان بلوایە، ئەو پەرلەمانە لە کارکەوتووە بێ توانایەشیان، هەر بەو شێوەیە دەهێشتەوە و گۆڕانکارییان تێدا نەدەکرد، نەبا، هەڵبژاردن بکرێ و لایەکیان لە لاکەی دیکەیان، دەنگ پتر بێنێ! هەر وەک چۆن، بنەماڵەی « بارزانیی » تا ماون، دەبێ، سەرۆکی « پارتیی » و « جەلال تاڵەبانیی »یش تا لە ژیاندابێ، دەبێ، سکرتێری گشتیی « یەکێتیی »

بن، نیازیان وابوو، پەرلەمانەکەش وا لێ بکەن. ئەگەر ناچاربوونایە و هەڵبژاردنیان بکردایە، لایەکیان، زۆربەی دەنگەکانی بهێنایە، زۆربەی کورسییەکانی پەرلەمانی بەرکەوتایە و هەر خۆشی، کابینەی میریی هەرێمی دامەزراندایە! چونکە، جگە لەوەی، یەکدییان پێ قەبووڵ ناکرێ، دەسەڵاتیشیان نەماوە، گەر لایەکیان دەرچوو، لاکەی دیکەیان ڕێتکاتەوە و جەنگێکی سەرتاسەریی هەڵگیرسێنێ!
بەڵام، لەوە دەچێ، ئێستە، هیچ چارەیەکیان نەمابێ، بیانەوێ و نەیانەوێ، هەڵبژاردن، لە سەرانسەری «عێراق»دا هەر دەکرێ. چونکە، تا ئێستەش، «باشووری کوردستان»، هەر بە بەشێ لە خاک و دەوڵەتی «عێراق» دادەنرێ. خۆ ناشێ، هێندە نازابن، بە عەرەبەکانی «عێراق» و هێزەکانی هاوپەیمان بڵێن: نەخێر، ئێمە لە «کوردستان»، هەڵبژاردنمان ناوێ، چونکە، بەرژەوەندیی پارتەکانمانی تێدا نییە! لەبەرئەوە، ئەوانیش ناچارن، بەشداریی تێدا بکەن.
بۆیە، چارەسەرێکی دیکەیان بۆ دۆزیوەتەوە، تا پەرلەمانەکە، بە هەمان شێوە بمێنێتەوە و لە دەسیان دەر نەچێ. ئەویش ئەوەیە، هەر دوولایان، بە یەک لیستی هاوبەش دابەزن و ڕکەبەرایەتیی یەکدی نەکەن. ئەمەش، لەبەر بەرژەوەندیی کورد نییە، بەڵکوو، لە ترسی یەکدی، ئەو کارە دەکەن. چونکە، ئەنجامی هەڵبژاردنەکەیان پێ هەرس ناکرێ! ئاخر، پێش ئەوەی، هەر دوو پارت، لە سەر لیستێکی هاوبەش ڕێککەون، کورسییەکانی پەرلەمان، وەک دەسکەوتی جەنگ، لە نێوان خۆیاندا دابەشکەن، بە تەواویی، ترسیان لێ نیشتبوو، نەبا، یەکێکیان بیباتەوە و ئەوی دیکەیان بیدۆڕێنێ. بۆیە، خۆیان سەرقاڵکردبوو، هەر دوو لایان، بە هەموو توانایانەوە هەوڵیاندەدا، بە هەر شێوەیەبێ، زۆرترین دەنگ کۆکەنەوە. لەبەرئەوە، هەر دوولایان، سەرۆک تیرە و هۆزەکانیان بانگدەکرد، دەمیان چەوردەکردن و بە دەم داواکارییەکانیانەوە دەچوون، چەندین جێی پەرستن و هۆڵی ڕۆشنبیرییشیان، بۆ «یەزدیی، کاکەیی، بابان و فەیلە ... »کان درووستدەکرد! لە هەموو «کوردستان»دا، زەوییان بە سەر زیندوو و مردوو، باش و خراپ، نیشتمانپەروەر و نیشتمانفرۆشدا، دابەش دەکرد، گوندەکانیان ئاوەداندەکردەوە، بێ کارەکانیان، لە دەزگە جیاجیاکانی میریی هەرێمدا دادەمەزراند، پارەیەکی زۆری بێ ئەندازەیان تەرخانکردبوو، بە ڕاست و چەپدا، بە سەر کەسانی بودەڵە و بێ هەڵوێستدا دەیانبەخشییەوە، تا دەنگیان بۆ بدەن، وەک چۆن، جادووگەرەکانی «سێرک»، هێلکەیان دەکرد بە ئارد و ئاردیشیان دەکرد بە

هێلکە، ئەوانیش، لە دزیی و فزیدا، لە خەڵک کریندا، هێندە زیرەک و بلیمەت بوون، بۆ بەرژەوەندیی تایبەتیی خۆیان، لە چاوترووکاندنێکدا، جاشیان بە باش، خراپیان بە چاک دەگۆڕییەوە، ناسنامەی نیشتمانپەروەرییان، بە ناپاکان و سەرکردەکانی « ئەنفال » دەبەخشی. تەنانەت شەهیدەکانیشیان، لەم پارتەوە بۆ ئەو پارت، بە پارە دەگواستەوە و لە سەر خۆیانیان تۆمار دەکردن! تا دەنگی خزم و ناسیاوەکانیان، بۆ خۆیان مسۆگەرکەن، لە سەر حسێبی کێشە نەتەوەیی و ڕامیارییەکەی کورد، پشتی یەکدی لە زەویی بدەن. جا خوای دەکرد، کورد ڤریتێدەکەوت و « کوردستان »یش، بە تەواویی وێراندەبوو! ئاخر، کام « کوردستان »، گەر « مەسعوود بارزانیی »، سەرۆکی گەلی کورد نەبێ، یا، « جەلال تاڵەبانیی »، ڕابەری هەرێم نەبێ؟!!

ئەوڕۆ، چ لە نێوەوە و چ لە دەرەوەی وڵات، کەسانێ هەن، دەڵێن: بۆ دەنگ بۆ پەرلەمانی « کوردستان » بدەین، خۆ ئەوان پێشەکیی، بڕیاری خۆیان داوە، هەموو کورسییەکانی پەرلەمان و پۆستەکانی شالیارگەکانیشیان، لە نێوان خۆیاندا دابەشکردووە؟ بە ڕاستیی، ئەمە بۆچوونێکی زۆر هەڵەیە.* چونکە، هەرچی چۆنێبێ، دەبێ، هەڵبژاردن لە « کوردستان » بکرێ، بەڵام، گرنگ ئەوەیە، نیشتمانپەروەرە دڵسۆزەکانی کورد بزانن، دەنگ بۆ کێ دەدەن! گەر ئەم بۆچوونە، لەوەوە هاتبێ، دەنگ بە لیستی « پارتیی » و « یەکێتیی » نەدەن، ئەوا دەتوانن، دەنگ بۆ لیستەکانی دیکە بدەن، تا، لە لایەکەوە، بوارێکیان بۆ بڕەخسێنن، لیستەکانیان سەرکەوتن بەدەستبێنن و چەن کورسییەک، لە پەرلەماندا وەرگرن. لە لایەکی دیکەوە، لە نێو پەرلەماندا، بەرەی ئۆپۆزیسیۆنی تێدا درووستبێ و هاوپەیمانێتیی لەگەڵ فراکسیۆنەکانی دیکەدا بکەن. لە لایەکی دیکەشەوە، خۆ هەر دەبێ، پەرلەمانێکی نوێ هەڵبژێردرێ، چونکە ئەو پەرلەمانە، بە هیچ شێوەیە، مافی ئەوەی نەماوە، بە ناوی گەلی کورد لە « باشووری کوردستان »دا بدوێ و بڕیاربدا، لەبەرئەوەی:

1. کاتی خۆی بڕیاردرا، لە ماوەی شەش مانگدا، هەڵبژاردنێکی نوێ بکرێ. چونکە، لایەنە بەشداربووەکان، بە ئەنجامی هەڵبژاردنەکە قایل نەبوون، گزیی و دزییەکی زۆری تێدا کرا و هەموو لایەنەکانیش، خۆیان دانیان بەو ڕاستییەدا نا.

2. لەو ماوەیەدا، هەڵبژاردنەکەیان دووبارە نەکردەوە. بەڵام دەبووایە، هەر هیچ نەبووایە، دوای چوار ساڵ، هەڵبژاردنی نوێیان بکردایە. کەچیی ئەوڕۆ، وا « سێ » چوار ساڵیی، بە سەر ماوەکەدا تێپەڕبوو، هەڵبژاردنەکەیان هەر نەکردا

3. هێندێ لە ئەندامانی پەرلەمانی هەر دوو فراکسیۆنی سەوز و زەرد، بەشدارییان لە جەنگی چەپەڵی نێوخۆدا کردووە و دەستیان بە خوێنی رۆڵەکانی کورد سووربووە. لەبەرئەوە بۆیان نییە، بە ناوی گەلی کوردەوە، هیچ جۆرە بڕیارێبدەن!
4. هەرکیز، پەرلەمانێکی راستەقینە نەبووە، بەڵکوو، وەک هاوبەیمانێتییەکی نێوان « پارتیی » و « یەکێتیی » وابووە. هەر دوو سەرۆک « بارزانیی » و « تاڵەبانیی »، لە پشت پەردەوە، چیان بڕیاردابێ، پاشان، بە گوێی نوێنەرەکانی خۆیاندا چرپاندبێ، ئەوانیش وەک تووتیی، هەر ئەوەیان، لە نێو کۆبوونەوەکانی پەرلەماندا دووبارەکردۆتەوە.
5. گەر راستە، هێندێ لە ئەندامانی پەرلەمان، خاوەن فایل بوون و پێوەندییان بە دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق »ەوە هەبووە، کامەیە ئەو پەرلەمانەی، هێندێ لە ئەندامەکانی، ناپاکییان لە خوێنی شەهیدان، رۆڵەکانی گەلی کورد و خاکی « کوردستان » کردووە؟!!
سەیر ئەوەیە، هەر کاتێ، رۆڵەکانی گەلی کورد لە « باشووری کوردستان »، پتر وشیاربوونەوە، هەستیان بە مەترسیی نوێبوونەوەی جەنگی نێوخۆ کردبێ، هەڵەی گەورەی سەرکردەکانیان لەقاودابێ، یەکسەر، هەر دوو سەرکردەی پارتی گەورە « بارزانیی » و « تاڵەبانیی » کۆبوونەتەوە، پاشان، لە چاوپێکەوتنێکی رۆژنامەنووسییدا و لە بەردەم کامێرای تێلێفیزیۆندا دەرکەوتوون، بە چەن ووشەیەکی بریقەداری بێ گیان، کۆمەڵانی خەڵکیان هەڵخەڵەتاندووە، گوایە: ئەورۆ لە هەموو رۆژێکی دیکە پتر، هەر دوو هێزی گەورە، لە سەر هەموو شتەکان، یەک دید و بۆچوونیان هەیە. ئەوەی لێرە و لەوێش دەبیسترێ، لە پروپاگەندەی دوژمنانی گەل پتر، هیچی دیکە نییە. پاشان گوتوویانە: چەن کۆمیتەیەکیشمان دامەزراندووە، تا هەموو کارە گرنگەکانی « سەرژمێری گشتیی، هەڵبژاردن، گفتوگۆ لەگەڵ بەغدا، گرفتی کەرکووک، کێشەی ئاوارەکان ... » پێکەوە چارەسەرکەین. نیدی، هەر بەو شێوەیە، کۆتاییان بە دیدارەکەیان هێناوە، بێ ئەوەی، هیچی دیکەی بەدوادا هاتبێ! بۆ نموونە. رۆژی « 22 .07 .2004 »، لە کەناڵی ئاسمانیی تیلیفیزیۆنەکانەوە، « جەلال تاڵەبانیی » گوتی: بڕیارماندا، کۆمیتەیەکی هاوبەش، بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمانی « کوردستان » و « عێراق » پێکبێنین. کەچیی، هەر ئێوارەی هەمان رۆژ، « سالار عەزیز »، لە بەرنامەی « دیدار »دا رایگەیاند، ئەو کۆمیتەیە، لە نێوان هەر دوو فراکسیۆنی زەرد و سەوزدا، نزیکەی دوو مانگ بوو، دامەزرابوو. بەڵام، تا ئەو کاتە، یەک کۆبوونەوەی

نەکـرابوو، هیچ جـۆرە هەنگاوێکی بە کـردەوە نەنابوو و هیچ جـۆرە بڕیارێکیشیان نەدابوو!
با، لە هەموو ئەو کەموکووڕیی و گرفتانە گەڕێین و کەمێ باسی هەڵبژاردن بکەین. پێشەکیی دەبێ، ڕۆڵەکانی گەلی کورد، لە خۆیان بپرسن و بڵێن: ئایا، هەڵبـژاردنی نوێ بۆ دەکرێ؟!! کێ هەڵدەبژێرن؟!! ئەنجامەکەی چی دەبێ؟!! ئەو پەرلەمـانەی، لە دووەمین خـولی هەڵبژاردندا پێکدێ، هەر وەک پەرلەمـانە کـۆنەکـە وادەبێ؟!! ئەمـانە و گـەلێ پرسـیـاری دیکەش، سـەرهەڵدەدەن و پێویستیان بە وەڵامی تێروتەسەل هەیە.
ئەز پێم وایە، گـەر تەنیـا هەر، هەڵبژاردن لەبەر هەڵبـژاردن بکرێ، مـاوەی فەرمیی پەرلەمانەکە بەسەرچووبێ، ڕەوایی خۆی لەدەستدابێ و کۆمـەڵێکی دیکەی نـوێ هەڵبـژێرن، بێ ئەوەی، هـیچ گـۆڕانێکی بنەڕەتیی، لە دەسـەڵاتی پەرلەماندا بکرێ، ئەوا، زۆر بە ڕاشکاویی دەڵێم: ئەو هەڵبژاردنە هـەر نەکرێ، گەلێ باشترە. چونکە، کۆمەڵانی خەڵک لە مێژە، لەگەڵ ئەو بـــارە نالەبارەی « کوردستان » و ئەو کۆمەڵە پەرلەمانتارەدا ڕاهاتوون، پێویستیان بەوە نییە، کۆمەڵێ دەموچاوی نوێی دیکە بێن، ئەوانیش وەک هەڤاڵەکانی پێشوویان، ماوەیەک کەشوفش، بە سـەر ڕۆڵەکـانی گـەلدا بکەن، بێ ئەوەی، هیچ جۆرە دەسەڵات و توانایەکیان هەبێ! ئاخر، « بەعسیی »ەکانیش لە « عێراق »، چەن جارێ، پرۆسەی هەڵبژاردنیان سازکرد، بەڵام، هەموو جارەکان وەک یەک وابوون، هیـچی نوێیـان تێـدا نەبوو، پەرلەمـانەکـەش، هیچ جـۆرە دەسـەڵاتێکی نەبوو، هەڵبـژاردنەکـانیش، وەک چەن وێنەیەک وابوون و لە بەر یەک جام شۆردرابوونەوە!
یا گەر، هێزەکانـــــــــی هاوپەیمان، پێیان لێ کردوونەتە کەوش و لە هەموو « عێراق »دا هەڵبژاردن دەکرێ، ئەمانیش ناچارن و دەبێ، دوای ئەو پرۆســە « ئەمێریکایی ـ عێراقیی »یە بکەون، ئەگینا، لە کاروان بەجێدەمێنن، ئەوەیان شتێکی دیکەیە و هەر لە ئێستەوە، ئەنجامەکەی دیارە!
ئەگینا، هەڵبژاردن لە نێـو هەموو کۆمـەڵگەیەکدا بۆیە دەکرێ، تا ڕۆڵەکانی گەل، نوێنەری ڕاستەقینەی خۆیان، بە ئازادیی هەڵبژێرن، بێ ئەوەی، گزیی و فزیی تێدا بکرێ، یا، هەوڵی پاوەنکردنی دەسەڵات بدرێ و هێز بەکاربێنرێ! چونکە، گەر پەرلەمانێکی ڕاستەقینە هەڵ نەبژێردرێ، دەستوورێکی ڕوون و نەگۆڕی نەبێ، هەموو دەسەڵاتە سەرەکییەکانی پەرلەمان دەستنیشان نەکرێ، هەموو دەسەڵاتەکان لە یەکدی جیا نەکرێنەوە، کەسێ یا لایەنێ، لە سەروو پەرلەمانەوە دابنرێ و بڕیاربدا، لە هەمـان کاتیشدا، نهێنییەکـان لە گەڵ

بشاردرێتەوە و کۆبوونەوەکانی پەرلەمان، بە تێلێفیزیۆن پیشانی جەماوەر نەدرێ، ئەوا، گەلێ باشترە، ئەو پەرلەمانە هەر نەبێ! بەڵام، گەر پەرلەمانێکی کارتۆنیی بێ، لە پشت پەردەوە، « بارزانیی » و « تاڵەبانیی »، ئەکتەرەکانی سەر شانۆ، وەک « مەیموون » هەڵبەرێنن، چی لە بەرژەوەندیی خۆیان و پارتەکانیان بێ، ئەوەیان بە کوێدا بچرپێنن، ئەوان، لە بری هەموو ئەندامانی پەرلەمان بڕیاربدەن، ئەوا، نە پەرلەمانێکی سەرکەوتوو دەبێ، نە پێویستیش دەکا، کۆمەڵانی خەڵک بخەڵەتێنن، خۆیان ماندوویکەن و هەڵبژاردن بکەن!
شتێکی سەیرە، هەر دوو سەرکردە ئامادەبوون، یەکێ لە پۆستەکانی سەرۆک کۆمار یا سەرۆک شالیارانی « عێراق » وەرگرن، بەڵام، یەکێکیان ئامادە نەبوو، پۆستی سەرۆک شالیارانی « کوردستان » وەرگرێ! ئەمە، گەر شتێ بگەیەنێ، تەنیا هەر ئەوەیە: دان بەو میرییەی هەرێمدا نانێن، خۆیان لە پەرلەمان و هەموو گەلی کوردیش بە گەورەتر دەزانن! واتە: زۆر بە کوڵەوە، داوای هەڵبژاردنێکی ڕاستەقینە و دیمۆکراسیی بۆ « عێراق » دەکەن، بەڵام، لەوە ناچێ، لە دیکتاتۆریی و پاوەنخوازیی پتر، هیچ بۆ « کوردستان »ەکەی خۆیان بخوازن! چونکە، هەرچەندە باسـی دیمۆکراسیی دەکەن، تەنانەت، « پارتیی » ئەوەتەی دامەزراوە، ئەو زاراوەیەی بە خۆیەوە لکاندووە، کە هەرگیز دیمۆکراسیی نەبووە! بەڵام، دیمۆکراسیی بە گەلی کورد ڕەوا نابینن، دەیانەوێ، گەلە سەردەستەکان دیمۆکراسیی بن، بۆ ئەوەی، گوێ لە خۆیان بگرن، بەڵام، کۆمەڵگەی کورد دیمۆکراسیی نەبێ، چونکە، ڕۆڵەکانی کورد، چاویان دەکرێتەوە و زۆر شتی خراپیان لێ قەبووڵ ناکەن!
جا، لە لایەکەوە، ناهەقیان ناگرم، چونکە، دیمۆکراسیی و سیستێمی بنەماڵە، دیمۆکراسیی و ئایدۆلۆژیای توندڕەو، دیمۆکراسیی و جەنگی نێوخۆ، هەرگیزا و هەرگیز، پێکەوە نەگونجاون و ناشگونجێن. ئاخر، دیمۆکراسیی و ئەو جۆرە خەسڵەتانە، وەک ئەوە وایە، مرۆڤێ بیەوێ، لە ئاسمان، تەلارێکی چەن نهۆم درووستکا! هەڵبەتە، ئەزموونی تفتوتاڵی دوازدە ســـاڵەی پەرلەمانی « کوردستان »یشمان لەبەرچاوە، نەک هەر هیچ دەسەڵاتێکی ڕەوای نەبوو، بەڵکوو، جگە لەوەی، هێندێ لە ئەندامەکانی، شیاوی ئەوە نەبوون، ئەندامی پەرلەمان بن، چونکە، بێ توانابوون، ئاستی ڕووناکبیریی و ڕامیارییان نزم بوو، ئاگایان لە زۆر ڕووداوی مێژوویی و ڕامیاریی نێوچەکە و جیهان نەبوو. لەبەرئەوە، ئەو دوو فراکسیۆنە لە نێو پەرلەماندا، وەک دوو لقی سەربازیی وابوون، هەر کاتێ، سەرکردەکانیان فەرمانیان پێ کردبن، بێ دەمەتەقێ و نارەزاییدەربڕین، یەکسەر قایلبوون! گەورەترین بەڵگەش، بۆ بێ توانایی و بێ

دەسەلاتیی ئەندامانی پەرلەمانەکە ئەوەیە: کاتێ جەنگی قرێژی نێوخۆ، لە نێوان « پارتیی » و « یەکێتیی »دا بەرپابوو، نەک هەر نەیانتوانی، ئاوێکی سارد بەو ئاگرە گەرمەدا بکەن و بیکوژێننەوە، بەڵکوو، خۆشیان بەشدارییان تێدا کرد و پەرلەمانەکەش لەکارکەوت! یا، دوای ئەوەی، رژێمی « بەعس » رووخا، نەک هەر نوێنەرانی پەرلەمان، لەگەڵ نوێنەری عەرەبەکانی « عێراق »دا دا نەنیشتن و بە ناوی گەلی کوردەوە قسەبکەن، بەڵکوو، یەک بڕیاریش چییە، لە هیچ بارەیەکەوە دەریان نەکرد. تەنانەت، شاندێکی نەنارد، باسی کێشەی کوردیان لەگەڵ بکا! کەچیی، هەر زوو، « بارزانیی » و « تاڵەبانیی »، هەر یەکە بە جیا و بە پەلە، خۆیان گەیاندە « بەغدا »ی پێتەخت، بە ناوی خۆیان و پارتەکانیانەوە، دەستیان بە راموسانی سەرانی پارتەکانی « عێراق » کرد، سەردانی مەلا، شێخ و پیاوە ئایینییەکانیان کرد، وایاندەزانی، بەو کارەیان، هەموو مافەکانی گەلی کورد دەستەبەردەکرێ! نەیاندەزانی، لە ماڵوێرانیی پتر، هیچی دیکەی لێ شین نابێ! چونکە، ناکۆکیی و دووبەرەکیی، هەمیشە بە فاکتەرێکی لاواز و بێ دەسەلاتیی، تەبایی و یەکێتییش، بە فاکتەرێکی هێز و دەسەلات دادەنرێ! یا گەر پەرلەمان، پەرلەمانێکی راستەقینە بووایە، هەڵبەتە دەبووایە، دوو بەڕێوەبەرێتی لە دوو شاری « کوردستان »دا دا نەمەزرایە، هەر دووکیان هەڵوەشاندایەتەوە، میرییەکی یەکگرتوو و بەهێزیان پێکبێنایە! ئیدی بۆ دەبێ، هەر لە ئێستەوە نیگەران نەبین و چاوەڕێی کاری چاکە، لە سەرکردەکانی ئەو دوو پارتە بکەین، گەر ئەوە رابردوویان بێ، ئەوە ئەزموونی پڕ لە شکست و کەموکووڕیی پەرلەمانەکە بێ و ئەوەش، پلانی نوێی هەڵبژاردنی داهاتوویان بێ؟!!
کەواتە: دوای ئەو هەموو ئەزموونە تاڵە، رۆڵەکانی کورد نابێ، دەنگی خۆیان، بە نوێنەرانی « پارتیی » و « یەکێتیی » بدەن. بەڵکوو، زۆر پێویستە، بە زووترین کات، دەستە و توێژە رووناکبیر و کۆمەلایەتییە جیاجیاکان کۆببنەوە، لە سەر بەرنامەیەکی دیاریکراوی هەڵبژاردن رێککەون، لیستێکی هەمەرەنگەی نیشتمانپەروەر رێکخەن، لە هەموو جۆرە خاوەن پیشە و بەهرەیەکی تێدابێ، بە ناوی لیستی بێلایەن و کوردپەروەرانەوە دابەزن. گەر زۆربەی دەنگەکانی گەلیان هێنا، ئەوا دەتوانن، کۆمەڵێکی شارەزا و تێکنۆکرات کۆکەنەوە، میرییەکی بە توانا و لێهاتوو پێکبێنن!

## سێ جۆر هەڵبژاردن:

بڕیار وایە، لە سەر سێ ئاستی جیاواز، سێ جۆرە هەڵبژاردن لە « عێراق »دا بکرێ:

1. هەڵبژاردنی گشتیی: ئەم جۆرەیان، لە سەر ئاستی هەموو نێوچەکانی « عێراق » دەکرێ. ئەندامانی پەرلەمان و سەرۆک کۆماری تێدا هەڵدەبژێردرێ. واتە: « عێراق »، بە یەک نێوچەی هەڵبژاردن دادەنرێ.
2. هەڵبژاردنی پارێزگەکان: ئەندامانی ئەنجوومەنی شارەوانیی تێدا هەڵدەبژێردرێ.
3. هەڵبژاردنی تایبەتیی: ئەم جۆرەشیان، لە سەر ئاستی نێوچە ڕزگارکراوەکانی « باشووری کوردستان » دەکرێ و لە نێوچەکانی « کەرکووک، خانەقین، شەنگار ... » دا ناکرێ. تەنیا، ئەندامانی پەرلەمانی هەرێمیشی تێدا هەڵدەبژێردرێ.
ئەز پێم وایە، هەموو کوردێ دەبێ، بەشداریی لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی « کوردستان » و ئەنجوومەنی هەموو شارەکانی « سولەیمانیی، کەرکووک، هەولێر، دهۆک و مووسڵ » دا بکا. بەڵام، هەرگیز نابێ، بەشداریی لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق » دا بکا، تا سەرانی عەرەب، دان بە هەموو مافە ڕەواکانی گەلی کورددا دەنێن.1*
ئەوەی ئەوڕۆ، لە زۆربەی زۆری ئەندامە گچکە و گەورەکانی « پارتیی » و « یەکێتیی » دەبیستێن و دەبینێن، ئەوەیە: زۆر بە کوڵ و دڵ، پڕوپاگەندە بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمانی « عێراق » دەکەن، پتر لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی « کوردستان »، هەوڵی بۆ دەدەن و خۆیانی پێوە ماندوو دەکەن. بەڵام، لەگەڵ ئەوەشدا، گەر « بارزانیی » و « تاڵەبانیی » بڵێن: بەشداریی لە هەڵبژاردندا مەکەن، ئەوا، بوقی پڕوپاگەندەکانیان، بە گۆشەیەکی « 180 » پلەیی بادەداتەوە، دژی پرۆسەی هەڵبژاردن دەدوێن، زیانە گەورە و گرانەکانی ڕوون دەکەنەوە، گەلێ گوتاریشی لە سەر دەنووسن، هەر وەک چیرۆکی پڕ لە سەیر و سەمەرەی شالیار و « باینجان » ەکەی لێدێ. چونکە ئەمانیش، شالیاری « باینجان » نین و ئەندامی ئەو دوو پارتەن، چیان لە بەرژەوەندیی کورد و ئایندەی « کوردستان » داوە!
هەڵبەتە، هەموو ئەو کوردە نیشتمانپەروەرە دڵسۆزانەی نایانەوێ، بەشداریی لە هەڵبژاردنی پەرلەمان و دارشتنەوەی بنچینە سەرەکییەکانی دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق » دا بکەن، هەروا بە خۆڕایی نییە، بەڵکوو، زۆر بە ئاشکرا دەبینێ: لە لایەکەوە، لێپرسراوانی پارت و دەوڵەتی « عێراق »، دان بە مافە ڕەواکانی گەلی کورددا نانێن. لەلایەکی دیکەشەوە، سەرکردایەتی هەر دوو پارتی گەورەی « باشوور »، جگە لەوەی، هەلە مێژووییەکەیان لەکیس کورد دا، هێندەش ئازا و کوردپەروەر نین، تەنیا بۆ جارێ، بە سەرانی ئەو

دەوڵەتە بڵێن: تا، هەموو عەرەبە هێنراوەکان، هەموو کوردە دەرکراوەکان، بۆ زێدی تایبەتیی خۆیان نەگەڕێنەوە، هەموو ئەو نێوچانەی لە « کوردستان » دابڕاون، بۆ سەر هەرێمی فیدراڵ نەگەڕێنەوە، تا، هەموو مافە ڕەواکانی گەلی کورد جێبەجێ نەکەن، ئێمە، بەشداریی لە هیچ جۆرە هەڵبژاردنێکدا ناکەین!
سەیر ئەوەیە، ئەندامانی ئەو دوو پارتە، لە وڵاتەکانی « ئەورووپا »، وەک دەلاڵ، پروپاگەندە بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمانی « عێراق » دەکەن، خەڵک هان دەدەن، دەنگ بۆ پەرلەمانی « عێراق » بدەن! لەوەش سەیرتر ئەوەیە: « 18 » لایەن لە « سوید » کۆبوونەتەوە، بلاوکراوەیەکیان واژووکردووە، کە تەنیا هەر، « پارتیی » و « یەکێتیی »، حسێبیان بۆ دەکرێ، ئەگینا، شازدە لایەنەکەی دیکە، هەر ناویان هەیە و کەس کا بە کڵاویان ناپێوێ! کەچیی، زۆر بێ شەرمانە نووسیویانە: (پێمانوایە بە شداریی نەکردنی هەر کوردێک لە دەنگداندا، ئەوە دەنگانە دژی دامەزراندنی عێراقێکی دیمۆکراتی فیدرالی کە مافەکانی گەلی کورد تێیدا مسۆگەرە.)«1»
ئاخر دەبێ، ئەو کۆمەڵە بووقلێدەرە نەزانە، بە چ مافێ، خەڵکی کورد بەوە تاوانبارکەن؟!! هەڵبەتە تا ئێستە، کەڵکیان لە ئەزموونی دەوڵەمەند و دیمۆکراسیی ئەم وڵاتانە وەر نەگرتووە، کە تێیدا دەژین! چونکە، هەر هەڵبژاردن و « ریفراندۆم »ێ بکرێ، هەموو کەسێ ئازادە، بەشداریی تێدا بکا، یا نەکا، کەسیش بۆی نییە، ئەو قسە قۆڕانەی پێ بڵێ! بە ڕاستیی، گەر کەمێ کوردپەروەر بوونایە، دوای فەلسەفەی بۆشی « عێراقچێتیی » نەکەوتنایە، هەڵبەتە، کەمێ هەڵوێستی کوردانەیان دەبوو!
بۆیە، هەر لە ئێستەوە هاواردەکەم، بەشداریی لە هەڵبژاردنی دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق »دا مەکەن، با، ڕەوایەتیی بەو داگیرکردنە نەدرێ. ئاخر، سبەینێ هەڵبژاردن کرا و هەموو شت لەدەستچوو، ئیدی، هاوارکردن وگوتار نووسین، چ کەڵکێکی دەبێ؟!!
لەوەش سەیرتر ئەوەیە، ڕۆژنامەی « کوردستانی نوێ »، پلاری لە کوردە نیشتمانپەروەرەکانی دەرەوەی وڵات داوە و نووسیوێتی: (هەندێ کورد لە دووری وڵاتەوە بۆ خۆیان دانیشتوون و دەڵێن کورد هیچی دەست نەکەوتووە.) «2»
ئایا، ئەوانەی دەرەوەی وڵات کورد نین؟!! ئایا، بۆیان نییە، دید و بۆچوونی تایبەتیی خۆیان دەربڕن؟!! مافی ئەوەیان نییە، ڕەخنە بگرن؟!! ئایا ناتوانن، بەشداریی لە ژان و ئازاری ڕۆڵەکانی گەلەکەی خۆیاندا بکەن؟!! ئایا نابێ،

بەرانبەر چارەنووسی نەتەوەی کورد بە گشتیی و ئەو ئەزموونەی گەلی کورد لە «باشوور» بە تایبەتیی نیگەرانبن؟!! هەڵبەتە، زۆربەی هەرە زۆری ئەو کوردانەی، لە دەرەوەی وڵات دەژین، لەم وڵاتانە لەدایک نەبوون، بەڵکوو زۆربەیان، ساڵانێکی دوورودرێژ، بە شێوەیە لە شێوەکان، لە کۆڕی خەباتی کوردایەتییدا بەشدارییانکردووە. ئاخر، ئەو جۆرە قسە و نووسینانە، گەر تەنیا قسەی چەن کەسێکی بێ هەست و هۆشی نەتەوەیی نەبن، لە قسە و نووسینی چەن کوردێکی ژیر و نیشتمانپەروەر ناچن! چونکە، هیچ کوردپەروەرێ ناتوانێ، دوور لە ئازار و ژان، گرفت و چەڵەمە، خەون و هیواکانی هاوزمانەکانی خۆیەوە بژی و شەوانە، بێ خەم سەر لە سەر سەرین بنێ!

لەگەڵ ئەوەشدا، بەشێکی زۆری عەرەبەکانی «عێراق»، لەم کات و ڕۆژەدا، خۆیان هەڵبژاردنیان ناوێ، وردەوردە، بڕیاری پاشەکشەکردن و بەشداریی نەکردن دەدەن، کەچیی، چەن کوردێکی «عێراقچیی»، لاقی نیشتمانپەروەران دەگرن و هێرشیان دەکەنە سەر! ئاخر، تا ئێستە، گەر هەر موسڵمانەکانی عەرەب بگرین، دەبینین: «سووننە»کان بە گشتیی، هەڵبژاردن لەم بارەدا ڕەتدەکەنەوە. بۆ نموونە: لە «بەغـــدا»، ئیمامی مزگەوتی «ئیبن تەیمیە»، «مەهدی ئەلصمیدعی» گوتی: (ئەوەی، بەشداریی لە هەڵبژاردندا بکا، پێش ئەوەی داگیرکەر بگەڕێتەوە، یاخییە. 2*)«3»

عەرەبە «شیعە»کانیش، لە نێو خۆیاندا، زۆر کۆک نین و دوو بەشن: بەشێکیان داوای بەشدارییکردن دەکەن. ئەم بەشەش، پتر لە ئایەتوڵڵا «عەلی سیستانیی»یەوە نزیکن. هەر وەک لە شاری «کەربەلا»، شێخ «ئەحمەد سافیی»، ئیمامی نوێژی هەینیی مزگەوتی «ئیمام حوسێن» لە گوتارێکیدا، (بەشدارییکردنی حەلاکرد و هەڕەشەی دۆزەخیشی، لە سەرپێچیکەران کرد.3* ) کەچیی، بەشەکەی دیکەیان، دژی بەشدارییکردن وەستاون. ئەم بەشەشیان، لە باڵەکەی «سەدر»دا خۆیان دەنوێنن! «3»

جا وەرە، موسوڵمانە عەرەبە هەژارەکان، لە نێوان ئەو دوو باڵە ئایینییەدا، ڕێی ڕاستی خۆیان بدۆزنەوە! ئەدی کورد، چی لە هەڵبژاردنی دەوڵەتێکی داگیرکەر داوە، گەر عەرەبەکان خۆیان، تا ئێستە نەزانن، چی دەکەن و چۆن هەڵوێست وەردەگرن؟!!

لە کاتێکدا، سەرکردایەتی هەر دوو پارتی گەورە و دەسەڵاتداری «باشوور»، زۆر بە کولودڵەوە، هەوڵ بۆ جێبەجێکردنی هەڵبژاردنی «عێراق» دەدەن، کۆمەڵانی خەڵک هاندەدەن، بەشداریی تێدا بکەن، کەچیی، ئەوا دوازدە ساڵی

ڕێک، بە سەر هەڵبژاردنی یەکەمین پەرلەمانی « باشوور »دا تێپەڕبوو، تەنیا هەر بە دەم نەبێ، باسی دووەمین هەڵبژاردنیان کردووە، ئەگینا، بە کردەوە هیچیان دیار نەبووە و نەشیانویستووە، هەڵبژاردن ئەنجامبدەن. چونکە، ئەو شێوە فرمانڕەویی و دەسەڵاتەی لە « باشوور »دا هەیانبووە، لە بەرژەوەندیی تایبەتیی خۆیاندا بووە، ئیدی، هەڵبژاردن بۆ کێ بکەن؟!!

ئاخر، گەر هەڵبژاردنی نوێ، بۆ پەرلەمانی « کوردستان » بکرێ، کوردەکانی « کەرکووک، خانەقین ... » و دەرەوەی وولات، بەشداریی تێدا نەکەن، ئیدی بۆ دەبێ، گەلی کورد بە گشتیی، کوردی دانیشتووی ئەو ناوچانە و دەرەوەی وولات بە تایبەتیی، لە هەڵبژاردنی « عێراق »دا بەشدارییبکەن و دەنگبدەن؟!!

4* جا، گەر ئەم کارە بکەن، هەڵبەتە دیارە، هوشیاریی نەتەوەیی و ڕامیاریی کورد، زۆر لاوازە! لەبەرئەوە، هەر کوردێ، خۆی بە نیشتمانپەروەر بزانێ، خاکی نیشتمانەکەی خۆی خۆشبوێ، دژی پرۆسەی بەعەرەبکردن و ڕاگوێزان بێ، هەوڵ بۆ گەڕانەوەی ناوچە بەعەرەبکراو و دابڕاوەکانی « کوردستان » بدا، هەستی نەتەوەیی و هوشیاریی ڕامیاریی بەهێزبێ، کەمێ ئابڕووی نەتەوەیی هەبێ، هەرگیز، بەشـــــداریی لە هەڵبژاردنی دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق »دا ناکا!

ئەوە تەنیا هەر، سەرکردایەتی ئەو دوو پارتە « عێراقچیی »یەن، خەمی کێشەی کورد ناخۆن و بیر لە پاشەڕۆژی ڕۆڵەکانی گەلی کورد ناکەنەوە، بەڵکوو، تەنیا هەر، خەمی کورسییەکانی خۆیان لە پەرلەمانی « عێراق »دا دەخۆن، تا، لە لایەکەوە، دڵی برا عەرەبەکانیان لێ نەڕەنجێ، لە لایەکی دیکەشەوە، پێیان لە « بەغدا »ی پێتەختی عروبە، پێتەختی تاوان و خوێن نەبڕێ. چونکە، بێ ئاو و هەوای « عێراق » ناژین! ئەم نیاز و ئامانجانەی خۆشیان، لە ژێر پەردەی دیارییکردنی ڕێژەی کورددا دەشارنەوە، کە ڕێژەی کورد، تا سەرژمێرێکی گشتیی لە « عێراق »دا نەکرێ، ژمارەی هەموو گرووپە ئیتنیکەکان نەزانرێ، هەرگیز بە دەنگدان، ڕێژەی کورد دیاریی ناکرێ! ئیدی، ڕۆڵە دڵسۆزەکانی کورد، چییان لە بەرنامە و بەرژەوەندیی ئەو دوو پارتە داوە، خۆ ئەوان، هێندەی کار بۆ دەوڵەتی « عێراق » دەکەن، هێندە کار بۆ « کوردستان »ەکەی خۆیان و ڕۆڵەکانی کورد ناکەن!

ئاخر، گەر نەگبەتیی کـــــــورد نەبێ، دوکتۆر « ڕۆژ نووریی شاوەیس »، لە « بەغدا » نوێنەری « پارتیی » دەبێ؟!! با بزانین، ئەو قسە بێ ناوەڕۆکانەی، دەربارەی هەڵبژاردن و شاری « کەرکووک » کردوونی، هەر هەمان ئەو قسانەی « سەددام حوسێن »ی دیکتاتۆر و دوژمنە سەرسەختەکەی کورد

نیيه، كه له هه‌فتاكاندا كردوويه‌تی؟!! له كاتێكدا، دوكتۆر جه‌ختی له سه‌ر ناسنامه‌ی كوردیی شاری « كه‌ركووك » كردووه، كه‌چی، له هه‌مان كاتیشدا گوتوویه‌تی: (ڕای خه‌ڵكی « كه‌ركووك » و نێوچه‌كانی دیكه وه‌رده‌گیرێ، گه‌ر له نێو سنووری « كوردستان »دا بن، هه‌موو ئه‌و نێوچانه‌ش، له سنووری « عێراق »ی دیمۆكراسیی فیدراڵیی یه‌ككگرتوودا ده‌بن و چاره‌سه‌ركردنی ئه‌و گرفته‌ش، له ڕێی یاساوه ده‌بێ و هه‌موو لایه‌نه « عێراقیی »یه‌كانیش، له سه‌ر ئه‌وه ڕێككه‌وتوون. 5*) «4»

پاشان گوتوویه‌تی: (یاسای به‌ڕێوه‌بردنی ده‌وڵه‌ت، كه له سه‌ری ڕێككه‌وتووین، ده‌ڵێ: ئه‌و كارانه دادپه‌روه‌رانه نییه. پێویسته، له ڕێی پرۆسه‌یه‌كی به‌رده‌وامه‌وه چاره‌سه‌ربكرێ. ئه‌مه‌ش، له دوای بڕیاردانی یاساكه‌وه ده‌سپێده‌كا و دوای بڕیاردانی ده‌ستووری هه‌میشه‌یی و هه‌ڵبژاردنی میرییه‌كی « عێراقیی »ش كۆتاییدێ. ئه‌وه‌ش له بنه‌ڕه‌تدا، چاره‌سه‌ری ئه‌و كێشانه ده‌كا، له سه‌روو هه‌موویشیانه‌وه، هه‌موو ئه‌و « كورد، توركمان، ئاشووریی و عه‌ره‌ب »انه‌ی به زۆر ڕاگوێزراون، بۆ زێدی خۆیان بگه‌ڕێنه‌وه. له پاڵ ئه‌وه‌شدا هه‌وڵبدرێ، باوه‌ڕ به‌و عه‌ره‌بانه بهێنرێ، كه دانیشتووانی ڕه‌سه‌نی ئه‌و نێوچانه نین، تا، به شێوه‌یه‌كی ئاشتیییانه، بۆ نێوچه ڕه‌سه‌نه‌كانی خۆیان بگه‌ڕێنه‌وه و قه‌ره‌بووشبكرێن. دوای ئه‌م هه‌نگاوانه، گشتپرسێ بۆ هاووڵاتییانی « كه‌ركووك » سازكرێ، تا بڕیاربده‌ن، ڕایان به‌رانبه‌ر یه‌كێتیی و سنووری « عێراق » دیارییبكه‌ن. 6*)«4»

ئاخر، پیاوێ خۆی به كورد بزانێ، ئه‌و هه‌موو ساڵه، خه‌باتی ڕامیاریی و چه‌كداریی كردبێ، ماوه‌یه سه‌رۆكی میریی هه‌رێم و ماوه‌یه‌كیش سه‌رۆكی په‌رله‌مانی « كوردستان » بووبێ، سووریش بزانێ، كورد خاكی داگیركراوه و عه‌ره‌به‌كان، غه‌دریان لێ كردووه، كه‌چی، تازه داوابكا، پرۆسیسی شێر و خه‌تی « ڕیفراندۆم »، له سه‌ر خاكی « كوردستان » بكرێ!

ئاخر، ئه‌و بڕیاردانه، به یه‌كێ له هه‌ڵه زه‌قه‌كانی « بارزانیی مسته‌فا »ش داده‌نرێ، كاتێ، ساڵی « 1970 »، به‌وه قایلبوو، كێشه‌ی « كه‌ركووك » بمێنێته‌وه و سه‌رژمێری گشتیی له سه‌ر بكرێ! دیاره، ئه‌م ڕامیاره گه‌ورانه‌ی ئه‌وڕۆش، هه‌ر له سه‌ر ڕێوشوێنی ئه‌و ده‌ڕۆن، گه‌ر له هێندێ بڕیاریشیدا، هه‌ڵه‌ش بووبێ!

باشه، گریمان سه‌رژمێر و « ڕیفراندۆم »یش كرا، زۆربه‌ی دانیشتووانی پارێزگه‌ی « كه‌ركووك » ده‌نگیاندا، له سه‌ر « باشووری كوردستان » نه‌بن، ئه‌و كاته، سه‌ركرده‌ی ئه‌و دوو پارته « عێراقچیی »یه، چی ده‌ڵێن؟!! چی ده‌كه‌ن؟!!

ئایا، بەو ئەنجامە قایلدەبن؟!! خۆ گەر قایلبن، ناپاکییەکی مێژوویی لە کورد دەکەن. گەر قایلیش نەبن، لە سەرتاسەری « کوردستان » و « عێراق »یشدا، جەنگ هەڵگیرسێن، هیچ جۆرە کەڵکێکی نابێ. چونکە، ئەوان لە رووی یاسایی و دەستوورییەوە، بەوە قایلبوون، سەرژمێر و « ریفراندۆم » بکرێ، دەبێ، بە ئەنجامەکەشی قایلبن!

گەلێ جار، سەرکردایەتی هەر دوو پارت، دید و بۆچوونی جیاواز و ناکۆکیان، دەربارەی گرفتی نێوەندیی بەعەرەبکردن دەربڕیوە. هەر رۆژەی شتێکیان گوتووە و بەپێی سەردەمەکەش، هەڵوێستی خۆیان دەسنیشانکردووە.

« کەرکووک »، گەر شارێکی تێکەڵاویێ، یا، گەر وەک هەموو شارەکانی دیکەی « کوردستان »، بە شارێکی « عێراقیی »ش دانرێ، ئێمە، قسەمان لە سەر دانیشتووانەکەی نییە، چ گرووپێکی ئیتنیکی زۆرتر تێدا دەژی. چونکە، هەر لە مێژوویەکی کۆنەوە بە گشتیی و لە سەرەتای ساڵەکانی سی سەدەی بیستەوە بە تایبەتیی، پرۆسەی بەعەرەبکردن و گۆڕینی رووخساری نەتەوەیی شارەکە بەردەوامبووە. بەڵام ئێمە، قسە لە سەر خاک دەکەین، خاکەکەی بەشێکی زیندووی گرنگ، لە خاکی « باشووری کوردستان » پێکدێنێ و بە هیچ شێوەیە، لێی جیا نابێتەوە. هەر کوردێ، چەن گەورەبێ، دان بەم راستییەدا نەنێ، واز لە پەک بستی خاکی نیشتمانەکەمان بێنێ، بە ناپاکێکی گەورە دادەنرێ!7*

کەواتە: پێشەکیی، هەر دوو سەرکردایەتی پارتی گەورە، وازیان لە شاری « کەرکووک » هێناوە و هەر بە دەسی خۆشیان، یاسای کاتیی « عێراق »یان واژووکردووە، بۆیە، ئەم گوتارانە دەدەن و رێشی بۆ خۆشدەکەن! چونکە، گەر وا نەبێ، کەس ماڵی خۆی هەراج ناکا و « ریفراندۆم »ی لە سەر ناکا!

ئاخر، گەر سەرکردەی پارتەکان، کەمێ هۆشیان هەبێ و بیرەوەریی نەتەوەییان تیژبێ، لە سەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی « عێراق »ەوە، بە دەیان یاسا دەرچووە، باسی مافەکانی گەلی کوردی کردووە، ئینجا، هیچیشیان جێبەجێ نەکراون. ئیدی، تازە بە تەمای یاسای کاتیی و دەستووری هەمیشەیی دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق » بن؟!! ئاخر، کەسێ بە تەمای عەرەب بێ، مافی رەوای خۆی بداتێ، بێ شێو سەردەنێتەوە!

ئەز لەو باوەڕەدام، ئەو کاتەی عەرەبەکان، ئەو پێشنیازانەی نوێنەری پارتەکانی « کوردستان »یان واژووکردووە، لە دڵی خۆیاندا، گاڵتەیان پێ کردوون و گوتوویانە: قوور بە سەر ئەو گەلەی، ئەمانە نوێنەری بن، بە خوا ساویلکە و دڵ پاکن، دوای هەشتا ساڵ داگیرکردن، تاڵانکردن، چەوساندنەوە

و بەڵێنی درۆ، تازە بە قسەی ئێمە هەڵدەخەڵەتێن! جا خۆ هەر واش دەرچوو، هەمووی دوای چەن رۆژێ بوو، « شێخ یاوەر »ی زاوای « پارتیی »، لە شاری « کەرکووک » ئەوەی ڕەتکردەوە و لە « ڕۆژبەیانیی » توورەبوو! ئێستەش، بە هیچ شێوەیە ئامادە نین، ئەو ڕاژە گەورەیەی « سـەددام » بە گەلی عەرەبی « عێراق »ی کردووە، تێکیبدەنەوە. ئاخر، ئەو عەرەبانەی ئەورۆ، کۆشتی تاوانەکانی « سەددام » ناخۆن، بەڵام، گۆشتاوەکەی دەخۆنەوە!!
سەرکردەی گەلانی بندەس، کاتێ گلۆڵەی دەوڵەتە داگیرکەرەکەیان دەکەوێتە لێژیی، بە هەموو تواناپانەوە هەوڵدەدەن، هێندەی دیکە تلۆریکەنەوە و بەرەو نەمانی بەرن. لە هەمان کاتیشدا، مافە نەتەوەیی و ڕامیارییەکانی خۆیان بەدیبێنن. کەچیی، سەرکردەکانی کورد، کاتێ دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق »، لە مەترسییدابێ، تووشی نەخۆشیی دەبن، خەو لە چاویان ناکەوێ، سەری دنیایان لێ دێتەوە یەک و کێشە سەرەکییەکەی خۆشیان بیردەچێتەوە، تا، چارەسەرێکی بنەڕەتیی گرفتی دەوڵەتە داگیرکەرەکەش نەکەن، واز نایەنن. بەڵێ، هەر « بارزانیی » و « تاڵەبانیی » بوون، وەک جووتێ کۆتری ئاشتیی، لە شەقەقەی باڵیان دەدا، ئاسمانی ڕوونی دەوڵەتەکانی جیهانیان تەیدەکرد، لە دەرگەی دیپلۆماسیی دەزگەکانی جیهانیان دەدا، تا سەربەخۆیی و سەروەریی، بۆ « عێراق »ی « هیوا » و « ئاشتیی » بگێڕنەوە!
ئەوەتە « مەسعوود بارزانیی »، وەک دەمڕاستێکی « عێراق »، وولاتانی جیهان دەگەڕێ، تا، باوەڕ بە سەرکردەکانیان بێنێ، پشتگیریی هەڵبژاردن بکەن. تەنانەت، کاتێ سەردانی « سوریا »ی کرد و چاوی بە « بەشار ئەلئەسەد » کەوت، (داوای لێ کرد، پشتگیریی ڕامیاریی و مەعنەویی هەڵبژاردن بکا، لەبەرئەوەی، هەڵوێستی ئەرێنی « سووریا »، بۆ پشتگیرییکردنی هەڵبژاردن، گەلێ گرنگە. 8*)«5»
هەروەها، لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەنووسیشدا، لە « دیمشق » گوتی: (دەربارەی باری « عێراق » و ئەوەی « سـووریا » دەتوانێ، لە پشتگیرییکردنی گەلی « عێراق » بیکا، لەگەڵ سەرۆک « ئەسەد »دا قسەمکرد. لە سەرەتادا، ئێمە پێویستمان بە پشتگیرییکردنی مەعنەویی هەیە. ئێمە، لە بەردەم هەڵبژاردن داین و پێویستمان بە هەڵوێستێکی ئەرێنی « سووریا » هەیە و ئەوەشم لە سەرۆک « ئەسەد » دەسکەوت. « سووریا »، کێش و قورسایی خۆی هەیە و پێوەندیی چارەنووسسازانەمان، لە نێواندا هەیە. ڕۆڵێکی ئەرێنی هەیە، یارمەتییماندەدا، گەلێ کۆسپ ببڕین. لەو بارەیەوە، پشتگیریی سـەرۆک « ئەسەد »م بەدەسهێنا. 9*)«6»

دیارە، وەک خۆی دەڵێ: « بەشار »یش بەڵێنیداوەتێ، یارمەتییبدا. چونکە، داوای شتێکی ئەوتۆی لێ نەکردووە، زیانی بۆ بەرژەکانی دەوڵەتی « عێراق » و نەتەوەی عەرەب هەبێ. لە هەمان کاتیشدا، داوای شتێکی تایبەتیی، بۆ کورد نەکردووە، تا، ئەو ڕەتیکاتەوە و بەڵێنی یارمەتییدانی نەداتێ!
سەیر ئەوەیە، ئەوەتەی دەوڵەتی « سووریا » دامەزراوە، ئازادیی و دیمۆکراسیی تێدا نەبووە، بۆ گەلە جیاوازەکانی، وەک گرتووخانەیەکی گەورە وابووە، بە تایبەتیی، لە سەرەتای ساڵەکانی شەستی سەدەی بیستەوە، تا ئەوڕۆ، بە جووتێ شێر « حافز و بەشار ئەسەدی باوک و کوڕ »، هەناسەیان لە گەلانی « سووریا » بڕیوە، بە هیچ شێوەیە، قایل نەبوون و قایلیش نابن، هەڵبژاردنێکی دیمۆکراسیی ئازادانە، لە « سووریا »دا بکرێ. کەچیی ئەوڕۆ، لە چانسی ڕەشی کورددا، ئەو شێرەپیاوە « بەشار » زۆر دیمۆکراسیی و ئاشتییخوازە، داوای هەڵبژاردن بۆ « عێراق » دەکا! ئەوە جگە لەوەی، چ پارتی « بەعس » و چ « ئەسەد »، جیاوازییەکی ئەوتۆیان، لەگەڵ « بەعس »ی « عێراق » و « سەددام »دا نەبووە و نییە. چونکە، هەر دوولایان، هەر لە یەک سەرچاوەی بیر و ئایدۆلۆژیاوە، بۆچوونەکانیان هەڵدەهێنجن، هەر بە یەک چاویش، لە کێشەی کورد دەڕوانن، چ لە « عێراق » و چ لە « سووریا »دا بێ!
لە کۆتاییشدا، زۆر بە ڕاشکاویی دەڵێم: بۆ کوردێکی نیشتمانپەروەر و بێلایەن، هیچ جیاوازییەکی نییە، گەر یەکێ لەو دوو زلهێزە: « پارتیی » یا « یەکێتیی »، زۆربەی دەنگەکانی گەل بەدەستبێنێ و لە هەڵبژاردندا دەرچێ! بەڵکوو، گرنگ ئەوەیە، ئەو پارتەی دەردەچێ، بە ڕاستیی نیشتمانپەروەربێ، ناپاکیی لە کورد نەکا، دانوستان، لە سەر یەک بست لە خاکی « کوردستان » نەکا، واز لە مافە ڕەواکانی کورد نەهێنێ، دیمۆکراسیی بچەسپێنێ و بەرانبەر دوژمنی داگیرکەر، توند و کەللەڕەق بێ!
بەڵام بە داخەوە، ئەوڕۆ ئەو مەرجانە، بە تەواویی، لە هیچیاندا نابینم. بۆیە، داوا لە هەموو کوردێکی بە هۆش و گۆش دەکەم، تا بە تەواویی، لێپرسراوانی عەرەبی « عێراق »، دان بە مافە ڕەواکانی گەلی کورددا نەنێن، بە هیچ جۆرێ، بەشداریی لە هەڵبژاردنی « عێراق »دا نەکەن، هەر وەک چۆن، ساڵی « 1921 »، دانیشتووانی شاری « سولەیمانیی »، بەشدارییان لە دەنگدان و هەڵبژاردنی شا « فەیسەڵ »دا نەکرد، زۆربەی هەرە زۆری دانیشتووانی شاری « کەرکووک »، دژی « فەیسەڵ » دەنگیاندا، هەروەها، دانیشتووانی هەر دوو شاری « هەولێر » و « موسڵ »یش، بە مەرجێ دەنگیاندا، مافە نەتەوەییەکانی کورد دابینکرێ! «7، 136-139».

گەر سەرانی پارتەکانی « باشوور »، لەبەرئەوە، بەشداریی لە هەڵبژاردندا بکەن و لەوە بترسن، نەبا، لێپرسراوانی عەرەب و « ئەمێریکا » بڵێن: کوردەکان پشتگیریی تیرۆریستان دەکەن، ئەوا ئەم بۆچوونە، بە هیچ شێوەیە ڕاست نییە. چونکە، جگە لەوەی، خۆمان قوربانیی دەستی تیرۆرین، ئەم لە یەکچوونی هەڵوێستەش، ڕێککەوت نەبێ، هیچی دیکە نییە. تەنیا هەر هێندە هەیە، بەرژەوەندیی هاوبەشی چەن لایەنێکی دژ بە یەک، لە خـــاڵێکدا یەکدەگرنەوە. ئاخر، کورد داوای مافە ڕەواکانی خۆی دەکا، نەک بەشداریی لە کردەوەی خراپی تیرۆریستانەی هێزە تاریکەکاندا بکا، یا، دژی پرۆسەی دیمۆکراسیی و ئازادیی بێ، یا، دژی هێزەکانی هاوپەیمان بجەنگێ!
گەر گەلی کورد بە گشتیی، بەشداریی لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی « عێراق »دا نەکا، ئەوا، گەلێ لەوە باشترە، نیوەی بەشداریی بکا و نیوەکەی دیکەی نەیکا. دەبا، تەنیا بۆ جارێکیش بێ، لە مێژووی تێکۆشانی نەتەوەیی خۆماندا، یەک دەنگ و یەک ڕەنگ بین، دژی هەڵبژاردنی پەرلەمانی « عێراق »، هەڵوێستێکی کوردانە وەرگرین، تا، بە هەموو لایەکمان، گوشـــار بۆ لێپرسراوانی دەوڵەتی « عێراق » بەرین، دان بە هەموو مافە ڕەواکانی گەلی کورددا بنێن، هەموو ناوچە بەعەرەبکراو و دابڕاوەکان، بۆ سەر سنووری سروشتیی « کوردستان » بگێڕنەوە. ئەم کارە دیمۆکراسیی و نەتەوەییە ڕەوا گەورەیەش، جگە لەوەی، پێویستی بە بڕیارێکی ڕامیاریی پەرلەمان و دەسەڵاتدارانی کورد هەیە، تەنیا هەر بە هەموانیش دەکرێ و پتریش، لە ئەستۆی هەر دوو پارتی دەسەڵاتدار دایە. بۆیە، ڕووی دەمی دڵسۆزییم، لە هەر دوو ســـــــەرکردە « بارزانیی » و « تاڵەبانیی » دەکەم، ئەم هەلە مێژووییە لەکیس کورد نەدەن، بەشداریی لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی « عێراق »دا نەکەن، بەڵکوو، تەنیا کار بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمانی « کوردســـتان » و ئەنجوومەنی پارێزگەکان بکەن. گەر هەڵبژاردنی « عێراق »یش دواخرا، ئەوا ئەوان، پێ لە ســــــــەر هەڵبژاردنی پەرلەمانی « کوردســـتان » داگرن و لە کاتی دیاریکراوی خۆیدا بیکەن. جگە لەوەی دەبێ، پتر، بایەخ بە پرۆسەی « ڕیفراندۆم » بدەن، گەر پێویستیشیکرد، مانگرتنێکی گشتیی، لە سەرانسەری « باشوور »دا ڕاگەیەنن، تا هەموو گەلانی جیهان بزانن، گەلی کورد، بە شێوەیەکی ئاشتییخوازانە، داوای مافە نەتەوەیی و دیمۆکراسییە ڕەواکانی خۆی دەکا. خۆ ناشکرێ، لە ئاستی ئەو هەموو دەستدرێژییانەی، بۆ سەر ڕۆڵەکانی گەلی کورد دەکرێ، سەرکردایەتی ئەو دوو هێزە دەسەڵاتدارە، چی دیکە بێ دەنگبن. هەڵبەتە، بەو کارەشیان، هەڵوێستێکی نەتەوەیی ڕاست دەنوێنن و مێژووش، ناویان ون ناکا!

## تێبینییەکان:

* لەو بارەیەوە، هەفتەنامەی « هاوبیر »، رۆژی « 2004. 12. 15 »، چاوپێکەوتنێکی لەگەڵدا کردم، لە گوتاری ئایندەدا بڵاویدەکەمەوە.
1* لە مێژە، لە گوتاری « ریفراندۆم » و « هەڵبژاردن » و لە « Kurdistanpost »دا، هەڵوێستی خۆم روونکردۆتەوە.
2* (ان من يشارك في الانتخابات قبل انسحاب المحتل عاص.)
3* (ان للمشاركه حرمه شرعيه لان المخالف يدخل الجهنم.)
4* ئەمە وەک دەڵێن: تەنیا هەر لە کورد روویداوە! ئەگینا، گەر وا نییە، بۆ دەبێ، هەموو خەڵکی « عێراق »، چ لە نێوەوە و چ لە دەرەوە، بۆیان هەبێ، بەشداریی لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی « عێراق »دا بکەن، کەچی، هیچ کوردێکی دەرەوەی وڵات، بۆی نەبێ، بەشداریی لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی « باشووری کوردستان »دا بکا؟!! ئایا، ئەوە هەر هەمان دید و بۆچوونی « سەددام » و رژێمی « بەعس » نییە، کە هەموو مافێکی لە کوردی دەرەوەی وڵات سەندبۆوە؟!! ئایا، ئەوە نیشانەی ئەوە نییە، سەرانی دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق »، لە لایەکەوە، بە یەک چاو، تەماشای گەلانی « عێراق » ناکەن!! لە لایەکی دیکەشەوە، بە هەموو شێوەیە دەیانەوێ، لە ژمارەی کورد کەمکەنەوە!

سەیر ئەوەیە، رۆژی « 2004. 12. 07 »، تیمەی بەشدارانی هەشتەمین فیستیڤاڵی رۆژەی « گەلاوێژ »، نزیکەی « 200 » کەس دەبووین، لە هاوینەهەواری « دوکان »، میوانی « جەلال تاڵەبانیی » بووین و لەگەڵیدا کۆبووینەوە. دوای ئەوەی، باسێکی باری رامیاریی « کوردستان » و هەڵبژاردنی بۆ کردین، بەشداربووان، پرسیارێکی زۆریان لێ کرد. منیش دوو پرسیارم لێ کرد و دەمەتەقێیەکی زۆرم لەگەڵدا کرد.
یەکەم: دەربارەی لیستی هاوبەش بوو. گوتم: ئێوە پێتان وا نییە، ئەزموونی تاڵی « فیفتی - فیفتی »، لە « کوردستان » دووبارەدەکەنەوە؟
گوتی: نەخێر.
دووەم: دەربارەی هەڵبژاردنی « عێراق » بوو. گوتم: گەر کوردی نێوچەکانی « کەرکووک، خانەقین، شەنگار ... » مافی ئەوەیان نەبێ، دەنگ بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمانەکەی خۆیان بدەن، گەر من وەک کوردێ، لەبەرئەوەی لە وڵاتی « سوید » دەژیم، مافی دەنگدانم بۆ پەرلەمانی « کوردستان » نەبێ، بەڵام، بۆمان هەبێ، دەنگ بۆ پەرلەمانی « عێراق » بدەین، بە چ هەقێ، داوامان لێ دەکەی، دەنگ بۆ پەرلەمانی ئەو دەوڵەتە بدەین، لە کاتێکدا، دەوڵەتەکە هەڵوەشاوەتەوە، سوپای نییە، ئەوانەی ئەورۆش، کاری دەوڵەتەکە بەڕێوەدەبەن، دان بە مافە رەواکانی گەلی کورددا نانێن، تا ئێستەش، کوردە دەرکراوەکان، بۆ زێدی خۆیان نەگەڕاونەتەوە، عەرەبە هێنراوەکان، هەر لە « کوردستان » ماونەتەوە، نێوچە دابڕاوەکان، بۆ سەر سنووری پێشووی « کوردستان » نەگەڕاونەتەوە؟!!
دیسانەوە، وەڵامیدامەوە و گوتی: بەڵام پێویستە، لە هەڵبژاردندا بەشدارییبکەین، بۆ ئەوەی، رێژەیەکی زۆرتر بێنین، لە پەرلەماندا دەمەتەقێیان لەگەڵدا بکەین و لە دەستووری هەمیشەیی دەوڵەتی « عێراق »یشدا، ئەو مافانە بچەسپێنین.

منیش کرتم: پێژەی کورد لە « عێراق »دا، بە هەڵبژاردن دیاریی ناکرێ، بەڵکوو، بە سەرژمێریی گشتیی دیاریدەکرێ. هەرچەندە، وەڵامیداینەوە و دەمەتەقێیەکی زۆرمان کرد، بەڵام، هیچمان بە وەڵامەکانی یەکدی، قایل نەبووین!

5* (سیتم لخذ رای اهالی کرکوک و المناطق الاخری فیما اذا کانت تقع ضمن حدود کردستان و ان کل هذه المناطق تقع ضمن حدود العراق الدیمقراطی الفیدرالی الموحد وان حل هذه المشکله سیتم من خلال القانون وقد اتفقت جمیع الاطراف العراقیه علی ذلک.)

6* (ان قانون اداره الدوله الذی اجمعنا علیه یقول ان هذه اجراات غیر عادله و یجب ان تعالج عن طریق عملیه مستمره تبدا بعد اقرار القانون و تنتهی بعد اقرار الدستور و انتخاب الحکومه الدائمیه العراقیه وهی تعتمد اساسا علی معالجه هذه المسائل و علی راسها عوده الاکراد و الترکمان و الاشوریین و العرب المهجرین عنوه، الی جانب ذلک العمل علی اقناع العرب من غیر السکان الاصلیین لهذه المناطق بالعوده الی مناطقهم الاصلیه بصوره سلمیه و تعویضهم مالیا. بعد هذه الاجراات سوف یجری استفتاء مواطنی کرکوک الذین سوف یقررون ماذا سیکون موقعهم من الوحده و الحدود العراقیه.)«4»

7* هەر لە کۆڕەکەی « دوکان »دا، « جەلال تاڵەبانیی »، دەربارەی « کەرکووک » گوتی: بیرە نەوتەکانی « کەرکووک »، خەریکە وشکدەکا و دوای چەن ساڵێکی دیکە، نەوتی تێدا نامێنێ! ئەمە چی دەگەیەنێ؟ ئایا، مەبەستی لەوە نەبووە، وردەوردە، ڕەوشێ بۆ پاشـــــەکشەکردن، لە « کوردستان »ێتی ئەو شارە و هەموو پارێزگەی « کەرکووک » خۆشکا و وازی لێ بێنن؟!! بۆچی ئێمە عەرەبین، شەڕی نەوت بکەین؟!! ئێمە، شەڕی نەوت ناکەین، قسە لە سەر هەژاریی یا دەوڵەمەندیی، سامانی سەر زەویی و ژێر زەویی ناکەین، بەڵکوو، قسە لە سەر خاک و جوگرافیا دەکەین، خوای دەکرد، لەبری نەوت، ژاری ماری تێدا دەبوو، پارێزگەی « کەرکووک »، هەر بە بەشێکی گرنگ و لەبنەهاتووی « باشووری کوردستان » دادەنرێ! جگە لەوەی، کێ دەڵێ، دوای چەن ساڵێکی دیکە، چاڵە نەوتەکانی « کەرکووک » وشکدەکا ؟!! بەپێی زانیاریی هەموو سەرچاوە ئەکادیمییەکانیش بێ، نەوتی « کەرکووک »، بە درووەمین یەدەکی نەوتی هەموو جیهان دادەنرێ!

ئاخر، کێشەی « مووسڵ »یشیان، هەر بەو شێوەیە چارەسەرکرد، بۆیە، ئەوڕۆ هەر دوو سەرۆکی پارت: « بارزانیی » و « تاڵەبانی »، بە شارێکی عەرەبیی دادەنێن، کە لە بنەڕەتدا، شارێکی دێرینی « کوردستان »ە و هەموو بەڵگەنامە مێژووییەکانیش، گەواهیی ئەوەمان بۆ دەدەن. بە ڕاستیی، لە مێژە گوتوومە و نووسیومە: گەر « پارتیی » و « یەکێتیی »، لە یەکدی نەترسانایە، ئەوا دەمێبوو، وازیان لە « کەرکووک » هێنابوو، بەو جۆرە « فیدرالیی »یەی سێ پارێزگەکەی « سولەیمانیی، هەولێر و دهۆک »یش قایلدەبوون!

سەیر ئەوەیە، « جەلال تاڵەبانیی »، ڕۆژی « 2004. 12. 28 »، لەگەڵ هێندێ لە ئەندام و کادیرەکانی « یەکێتیی » مەڵبەندی « کەرکووک » کۆبۆوە، کەچیی، بە پێچەوانەی ئەو قسانەی خۆیەوە گوتی: بایەخی « کەرکووک » لەوەدا نییە، چەندێ نەوت تێدا هەیە، بەڵکوو، لە بەر ستراتیژیی گرنگی شارەکەیە، وازی لێ ناهێنین، لە ڕووی ڕامیاریی، ئابووریی و فەرهەنگیشەوە، لێی دەڕوانین. ئاخر، ئەمە چەنی بە چەن؟!!

8* (اوضح بارزانی ل " الحیاه " انه طلب من الاسد « دعما معنویا من الانتخابات لان الموقف الایجابی السوری فی دعم الانتخابات مهم جدا.)

*9 (لقد تحدثت مع الرئيس الاسد حول الوضع في العراق وما يمكن ان تقوم به سوريه من تقديم دعم للشعب العراقي، في البدايه نحن نحتاج الى الدعم المعنوي. نحن بصدد اجراء الانتخابات ونحتاج الى موقف ايجابي من سوريه. و هذا الذي حصلت عليه من الرئيس الاسد. فسوريه لها وزنها و ثقلها و علاقاتها المصيريه بيننا و بينها. ولها دور ايجابي سيساعد على تجاوز الكثير من العقبات. وبهذا الخصوص حصلت على دعم الرئيس الاسد.) «6»

سەرچاوەكان:
1. ڕاگەیاندنی كۆتایی كۆبوونەوەی پارتەسیاسیەكانی كوردستانی عێراق و كۆمەڵە كوردستانیەكان و ڕێكخراوە دیموكراتی و مرۆییەكانی دەرەوەی وولات لە سوید. ستۆكهۆڵم. 2004. 10. 24
2. كوردستانی نوێ، ژمارە 13، 3418 .2004. 07، ل1.
3. عدنان حسين، عراقيون! .. الى جهنم!، Kdp.info، 2004. 10. 27
4. نائب الرئيس العراقي شاويس: كركوك محافظه كردستانيه و المصادر التاريخيه توكد ذلك، kdp.info, 2004. 10. 22
5. بارزاني ل « الحياة »: الاسد متحمس لاجراء انتخابات العراق في موعدها، كدپ.ينفۆ، 4002. 10. 19
6. بارزاني: كركوك قضيه عراقيه داخليه و لا يحق لاي دوله التدخل فيها، KDP.info، 2004. 10. 19
7. دكتور كمال مظهر، كركوك و توابعها، حكم التاريخ و الضمير، دراسه وثائقيه عن القضيه الكرديه في العراق، الجزء الاول، 2004.

# « هاوبیر »و پێنج پرسیار دەربارەی هەڵبژاردن

1. تا چەند گەشبینی بە بەشدارییکردنی خەڵکی کوردستان لە پەرلەمانی کوردستاندا؟

لەبەرئەوەی، ئەز لە « کوردستان » ناژیم، هەر لە دوورەوە، ئاگام لە ڕەوشی ڕامیاریی « کوردستان » و باری ژیانی کۆمەڵانی خەڵک هەیە، ناتوانم، بە تەواویی، وەڵامی ئەم پرسیارە بدەمەوە. بەڵام، بەپێی هەموو ئەو هەڵە، تاوان و خراپەکارییانە بێ، کە پارتەکانی « باشووری کوردستان » بە گشتیی، هەر دوو پارتی گەورە و دەسەڵاتدار بە تایبەتیی کردوویانە، دەبێ، ڕێژەیەکی زۆر، بەشداریی لە هەڵبژاردندا نەکەن. یا، گەر بەشدارییشبکەن، دەنگ بۆ ئەوان نەدەن. بەڵام هیوادارم، زۆربەی هەرە زۆری ڕۆڵەکانی گەلی کورد، بەشداریی لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی « کوردستان »دا بکەن.

2. ئایا، بەشدارییکردن لە هەڵبژاردنی « عێراق »دا، ئەچێتە ئاستی ناپاکیی نەتەوەییەوە؟

بەم پرسیارەدا، شتێکی سەیرم بیرکەوتەوە. « یوسف زۆزانیی »، لە کۆڕێکی تێلێڤیزیۆنی « Kurdsat »دا گوتی: (ئەوەی بەشداریی لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی « عێراق »دا نەکا، ناپاکیی لە گەلی کورد دەکا.) بە ڕاستیی، ئەم دید و بۆچوونە، زۆر ساکارانەیە. ئاخر، لە هیچ دەوڵەتێکی ئەم جیهانەدا نەبووە و نییە، گەر یەکێ، بەشداریی لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی وڵاتەکەیدا نەکرد، بە ناپاک دانرێ!

ئینجا، لە وەڵامی پرسیارەکەتدا دەڵێم: هێندە ناپاکیی، لە مێژووی کۆن و نوێی نەتەوەکەماندا ڕوویداوە، گەر بەشدارییکردن لە هەڵبژاردندا، بە ناپاکیی دانرێ، لە چاو ئەو ناپاکییانەی دیکەدا، هەر هیچ نییە! بۆچی، « جەنگی نێوخۆ، کوردکوشتن، گەل چەواشەکردن و وازهێنان لە مافە ڕەوکانی گەلی

کورد »، بە ناپاکیی نازمێردرێ؟!! ئاخر، کێشە و باسی ناپاکیی، شتێکی ڕێژەیی نەبێ، هیچی دیکە نییە. چونکە، « عێراقچیی »ەکان بە پێچەوانەوە، لەو باسە گرنگە دەڕوانن. نەتەوەیی و موسوڵمانەکانیش، بە شێوەیەکی دیکە، هەڵوێست وەردەگرن. من لە گوتاری « ڕیفراندۆم » و « هەڵبژاردن »دا، زۆر بە ڕوونیی، هەڵوێستی خۆم دیاریکردووە. هیوادارم، لەگەڵ ئەم چاوپێکەوتنەدا، بڵاویکەنەوە.

هەرچی چۆنێبێ، گەر ڕۆڵەکانی گەلی کورد، لە « ڕیفراندۆم »ێکی ئازادانەدا بڕیاربدەن، لە نێو چوارچێوەی سنووری دەوڵەتی « عێراق »دا بمێننەوە، ئەوا دەبێ، گەر هەموو نەبێ، زۆربەی هەر زۆری ڕۆڵەکانی گەل، بەشداریی لە هەڵبژاردندا بکەن، تا، ژمارەیەکی زۆرتر، لە کورسییەکانی پەرلەمانمان بەرکەوێ. بەڵام، ئەمە کەی دەبێ؟ کاتێ دەبێ، کە دەسەڵاتدارانی « عێراق »، هەموو مافە ڕەواکانی کوردیان دابینکردبێ. بە کورتیی: من خۆم، دەنگ بۆ پەرلەمان و سەرانی دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق » نادەم، جا، هەر کەس بۆ خۆی ئازادە، بە چ شێوەیە، هەڵوێست وەردەگرێ.

3. ئەو لیستەی بەڕێزت تیا بەشداری، چۆن لە لیستەکانی تر خۆی جیادەکاتەوە؟

ئەز، لە سەر لیستی « زەحمەتکێشان و سەربەخۆکان »، خۆم پاڵاوتووە. ڕەنگە جیاوازییەکە، پتر لە چۆنێتی پاڵێوراوەکان، بەرنامە و دروشمەکاندا بێ. هەڵبەتە، بەرنامەی سەربەخۆیی، لەگەڵ بیر و باوەڕی نەتەوەیی دێمۆکراسیخوازانەی مندا دەگونجێ. بەڵام، دید و بۆچوونی « عێراقچێتی »، نە هەرگیز گونجاوە و نە هەرگیزیش دەگونجێ، مەگەر دەوڵەتی « عێراق »، وەک « سویسرا »ی لێبێ، هیچ جۆرە چەوساندنەوە و جیاوازییەکی نەتەوەیی تێدا نەمێنێ!

جگە لەوەی، ئەو لیستە، ڕکەبەرایەتی گەورەترین لیستی پارتەکان دەکا. ئێمە، لە پێناوی چەسپاندن و قووڵبوونەوەی پرۆسەی دێمۆکراسیدا هەوڵدەدەین و دەمانەوێ، دابونەریتێکی دێمۆکراسیی، لە « کوردستان »دا بیادەکەین و بچەسپێنین، نەک تەنیا هەر، لە بەر خاتری چەن کورسییەک، هەڵبژاردن بکەین! ئەوان، هەڵبژاردن لە سەر هیچ ناکەن. چونکە، ڕکەبەریان نییە. پێشەکیی، لە سەر دابەشکردنی کورسییەکانی پەرلەمان ڕێککەوتوون. وەک دەڵێن: تەنانەت لە سەر دابەشکردنی پۆستەکانی دەسەڵاتی میرییش، هیچ گرفتێ لە نێوانیاندا نەماوە. جا ئیدی، چۆن جیاوازیی، لە نێوان ئەو لیستەی ئێمە و ئەواندا نییە؟!!

ئەوان، هەڵبژاردن بۆ ناشتنی تەرمی پەرلەمانی کۆن دەکەن، چەن دەموچاوێ، بە چەن دەموچاوێکی دیکە دەگۆڕن. بەڵام، ئێمە خۆمان دەپاڵێوین، تا، ڕۆڵەکانی گەلەکەمان، دەنگمان بۆ بدەن و چەن کورسییەک، لە پەرلەمان بەرینەوە. ئێمە، پشت بە دەنگی ئازاد و ویژدانی زیندووی ڕۆڵەکانی گەلی کورد دەبەستین. ئەوان، پێویستیان بەو دەنگە ئازاد و ویژدانە زیندووانە نییە. چونکە، پێش ئەوەی، پرس بە گەل بکەن، خۆیان بپاڵێون، تا دەنگیان بۆ بدەن، پێشەکیی، بڕیاری دەرچوون و دابەشکردنی کورسییەکانی پەرلەمانیان داوە. ئەمەش، نە بە دیموکراسیی و نە بە هەڵبژاردن دادەنرێ، بەڵکوو، ئەزموونی تاڵی پڕ لە هەڵەی « فیفتی ـ فیفتی » دووبارەدەکەنەوە. بەهانەکەشیان ئەوەیە: گوایە، یەکڕیزیی و یەکێتیی ڕیزەکانی گەل دەپارێزن! ئایا ناکرێ، هەر لیستێ، بە تەنیا خۆی بپاڵێوێ، ئەو یەکڕیزیی و یەکێتییەش بپارێزن، گەر ئەوان، باوەڕیان بە دیموکراسیی هەیە؟!! بەڵام، چونکە ئەوان، باوەڕیان بە پاوەنخوازیی هەیە، باوەڕێکی تەواویان، بە دیموکراسیی نییە، بەڵکوو، لە دیموکراسیی دەترسن، لە ئەنجامی هەڵبژاردنەکە دڵنیانین، دەترسن، لایەکیان دەنگی پتر و لاکەی دیکەیان، دەنگی کەمتر بێنێ، هیچ لایەکیشیان، نە فێری ئەوە بووە، دەنگی کەم بێنێ و لە بەرەی ئۆپۆزیسیۆندا بمێنێتەوە، نە بە ئەنجامی هەڵبژاردنەکە قایلدەبێ و نە یەکدیشیان پێ قەبووڵدەکرێ!
بەڵام، ئێمە، گەر چەن دەنگێکی کەمیش بێنین، زۆر لەوە باشترە، ئەزموونی خراپی چەن ساڵە دووبارەکەینەوە، دەرۆزەی چەن کورسییەک، لە ئەوان بکەین، گەر دەریش نەچین، ئەوا هەر گرنگ نییە، گرنگ ئەوەیە، خۆمان تاقیدەکەینەوە، تا بزانین، ڕۆڵەکانی گەلەکەمان، تا چەن باوەڕمان پێ دەکەن. ئەوە، جیاوازیی سەرەکیی ئێمە و ئەوان بوو!

4. بۆچی لەگەڵ کەسایەتییە نەتەوەییەکان پێکەوە، لیستێکی سەربەخۆتان ساز نەکرد؟ ئایا، خەواندنی پێنج هەزار دۆلار، یەکێ لە ڕێگرەکان بوو؟
هەڵبژاردنی پەرلەمان، پێوەندیی بە بیر، فەلسەفە و ئایدۆلۆژیاوە نییە. لە هەڵبژاردندا دەبێ، هاوپەیمانێتیی، لە نێوان بیر و فەلسەفە جیاجیاکاندا بکرێ. ئەو بیر و فەلسەفانەی، لە یەکدییەوە نزیکن. یا، لە دروشمی سەرەکییدا یەک دەگرنەوە. یا، لە ئامانجێکی ستراتیژیی گرنگدا، بە یەک دەگەن. گەر «کۆمۆنیست، ناسیۆنالیست، دیموکرات، سۆسیال دیموکرات، لیبراڵ ... »کان، سەربەخۆخوازبن، ئامانجی سەرەکییان، ئازادیی کورد و سەربەخۆیی « کوردستان » بێ، ئیدی بۆ دەبێ، نەتەوەییەکانی کورد، بە

لیستێکی جیاواز دابەزن؟!! ئایا ئامانجەکە، تەنیا هەر، خۆی لەو بەرنامە و دروشمانەدا نابینێ؟!! پاشان، کامانەن ئەو کەسایەتییە ناسیۆنالیستانەی لە « کوردستان » هەن؟!! ژمارەیان چەندە؟!! شوێنپەنجەیان، لە کاری نەتەوەیی، خەباتی رامیاریی و پرۆسەی دیمۆکراسییدا چییە، تا بە یەک لیستی تایبەتیی دابەزن؟!!

لە کۆتایی ئەم پرسیارەدا دەڵێم: گەر ئەو کەسایەتییە نەتەوەییانە هەبن، باوەڕیان بە خۆیان هەبێ، هەرگیز، پێنج هەزار دۆلار، گرفتێکی گەورە، لە بەردەم لیستی جیاوازدا دروست ناکا!

بە راستیی، ئەوڕۆ لە هەموو جیهاندا، چەرخی ئایدۆلۆژیای تەسک بەسەرچووە، بە تایبەتیی، ململانێی ئایدۆلۆژیا، هێندەی دیکە، ئەندامەکانی جەستەی نەتەوەیەکی داگیر و دابەشکراوی وەک کورد دادەڕزێنێ. لەبەرئەوە، ئەز وەک نەتەوەییەک، لە مێژە، باوەڕم بە گەلەکۆمەکەی بیر و ئایدۆلۆژیا نەماوە، بەڵکوو، باوەڕێکی تەواوم، بە تەبایی و یەکێتیی ڕیزەکانی نەتەوەکەم هەیە. هەوڵدەدەم، بنچینە سەرەکییەکانی دیمۆکراسیی، لە نێو کۆمەڵی کورددا بچەسپێنم، گەشەی پێ بکەم، قووڵیکەمەوە، تا ڕۆڵەکانی گەلەکەم، بێ ترس و دڵەڕاوکە، لە کەشێکی دیمۆکراسییدا، زۆر بە ئازادیی، خۆیان بپاڵێون، یا، دەنگ بۆ پاڵێوراوان بدەن، لە ئەنجامیشدا، کۆمەڵگەیەکی تەندرووست و ڕێکوپێک دامەزرێنین، لە لایەکەوە، پاوەنخوازیی، هەڕەشلێکرد، چاوسوورکردنەوە، تۆقاندن و کوشتن، لە لایەکی دیکەوە، ماستاو ساردکردنەوە، دەمچەورکردن و هەموو نیشانەکانی دیکەی گەندەڵیی نەهێڵین! ئەمانەش، تەنیا هەر، بە دانیشتن، دیالۆگ، گفتوگۆی دیمۆکراسیی و ئازاد بەدیدێ، نەک بیر و ئایدۆلۆژیا، ڕۆڵێکی گرنگی تێدا ببینێ!

5. کەسانێک هەن، هەڵبژاردنی کوردستانیش ڕەتدەکەنەوە. ئایا، ئەمە رایەکی ڕاستە یان خوارە؟

بە ڕاستیی، ئەمە دید و بۆچوونێکی زۆر خراپ و ساکارانەیە. چونکە دەبێ، جیاوازیی، لە نێوان پەرلەمانی نیشتمانەکەمان و پەرلەمانی دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق »دا بکەین. ڕاستە، پەرلەمانی پێشوو « 1992 - 2005 »، جگە لەوەی، ڕەوایەتی خۆی لەدەستداوە، واتە: لەو کاتەوە دەبووایە، سێ هەڵبژاردن بکرایە. دەسەڵات، سەرۆرەیی و توانای نەبووە، دوو پارتە گەورەکەش خۆیان، ڕێزیان لێ نەگرتووە. بۆیە، کەسانێ هەن، تووشی نائومێدیی و ڕەشبینیی بوون، باوەڕیان بەو دوو پارتە و سەرکردەکانیان

نەمـاوە، وا دەزانن، گـەر دەنگ بۆ پەرلەمـانی « کـوردسـتـان » نەدەن، ئـیدی
هەموو کەموکووڕیی و هەڵەکان، بەوە چارەسەردەکرێ. بەڵام، هیچ گرفتێ، بە
هەڵە چارەسـەر ناکرێ، بەڵکوو دەبێ، دەنگ بۆ نوێنەری ڕاستەقینەی خۆیان
بدەن، تا، داکۆکیی لە بەرنامە و دروشمەکانیان بکەن، ئامانجە « نەتەوەیی،
ڕامیاریی، ئابووریی، کۆمەڵایەتیی، کەلتووریی »یەکانیان بەدیبێنن.
ڕاستە، هەڵەیەکی زۆر کراوە، گەلێ تاوان، بەرانبەر گەلەکەمان ئەنجامدراوە،
سـەرکـردایەتی ئەو دوو پارتە، لە ئاسـتـی داگـیـرکـەراندا، وەک پێـویـست،
داکـۆکـیـیـان لە مـافـە ڕەواکـانی کـورد نەکـردووە. بەڵام، بە دەنگنەدان و
دژایەتییکردنی لیستەکانی پەرلەمان، هیچ لەو بارە نالەبارە ناگۆڕێ. بۆیە
دەبێ، دەنگبدەین، تا، کۆتایی بەو تراژیدیا گاڵتەجارییەی پەرلەمانی کۆن
بێنین. گەشە بە پرۆسەی دیمۆکراسیی بدەین، هەڵبژاردنێکی نوێ بکەین،
پەرلەمانەکەمان نوێکەینەوە، بە کادیری تێگەیشتوو، پێگەیشتوو، دڵسۆز و
کـوردپەروەری دیکە، دەوڵەمـەندیکەین، بەرنامـەی نوێ و کـوردپەروەرانە
پێشنیازکەین، لە بێ دەسەڵاتیی و بێ توانایی ڕزگاریکەن، خوێنێکی گەش و
نوێ، بە شادەمارەکانی ببەخشین، گیانێکی زیندووی پەبەردابکەینەوە.
ئەمە، پوختەی دید و بۆچوونی من بوو، هەموو کوردێکیش ئازادە، دەنگ بۆ
پەرلەمـانی « کوردسـتـان » یا « عێراق » دەدا. بەڵام، تکایەکی کوردانەم، لە
ڕۆڵەکانی کورد هەیە، بیرێ لەو بڕیار و هەڵوێستەی خۆیان بکەنەوە، ئەوەی
پێویستە، دەنگی بۆ بدەن، تەنیا پەرلەمانی « کوردستان »ـەکەیانە، ئەوەی
دەبێ، دەنگیشی بۆ نەدەن، پەرلەمانی « عێراق »ە، تا گوشاریان بۆ بەرین،
دان بە هەموو مافە ڕەواکانی گەلەکەماندا بنێن. چونکە، گەر گەلەکەمان،
پەرلەمانێکی ڕاستەقینە و هەڵبژێردراوی نەبێ، لەم قۆناغە ناسکەدا، دەنگ
نەدەین و دژایەتییبکەین، جگە لەوەی، ئەزموونەکەمان لاوازدەبێ و سەر
ناکەوێ، لە بەردەم گەلانی جیهانیشدا چی بڵێین و کێ، بڕیار لە سەر
یاساکانی هەرێمی « کوردستان » بدا؟!!
لە کۆتاییدا، هیوای هەڵبژاردنێکی دیمۆکراسیی و دەنگدانێکی ئازادانە
دەخوازم، تا ڕۆڵەکانی کورد، لە سایەی سێبەری « کوردستان »ێکی سەربەخۆ
و گەلێکی بەختیاردا، بە ئازادیی و خۆشیی بژین.

* * *

**تێبینییەکان:**

1. « هاوڕێ »، ڕۆژنامەیەکی ئەهلیی سەربەخۆیە، کۆمەڵێ هاوبیری نەتەوەیی، لە شاری « سولەیمانیی » دەریدەکەن.
2. ئەم چاوپێکەوتنە، ڕۆژی « 15 .12 .2004 »، لە شاری « سولەیمانیی »، سەرنووسەری ڕۆژنامەکە کاک « نزار محەممەد » ئەنجامیدارە.
3. « یوسف زۆزانیی »، کادیرێکی پێشکەوتووی « یەکێتی نیشتمانیی کوردستان »ە.

# پرۆسەی « ڕێفراندۆم »

گومانی تێدا نییە، پرۆسەی « ڕێفراندۆم »، بەپێی بۆچوون و بەرژەوەندیی گەلە جیاوازەکان دەگۆڕێ. واتە: پرۆسەکە بۆ گەلێکی بندەس و چەوساوە، بە کارێکی دیمۆکراسیی و چارەنووسسازانە دەژمێردرێ. بەڵام، بە لای گەلە سەردەسە داگیرکەرەکانەوە، بە جیاوازیخوازیی و ناپاکیی دادەنرێ. بۆیە، شۆڤێنیستێکی خێڵەکیی وەک شێخ « یاوەر »، بزووتنەوەی « ڕیفراندۆم »ی، بە ناپاکیی دانا و هەڕەشەی نوێبوونەوەی جەنگی لە کورد کرد!
بەڵام، ئەوەی تا ئێستە بیستوومانە و خوێندوومانەتەوە، سەرکردایەتی هەموو نەتەوە بندەس و چەوساوەکان، کاتێ ویستوویانە، نەتەوەکەی خۆیان، لە ژێردەسیی و چەوساندنەوە ڕزگارکەن، وڵاتەکەی خۆیان، لە دەس سوپای داگیرکەر ئازادکەن، دەوڵەتێکی نەتەوەیی سەربەخۆ، لە سەر بستەبستی خاکی نیشتمانەکەی خۆیان دامەزرێنن، گەر باوەڕیان، بە پرینسیپەکانی دیمۆکراسیی هەبووبێ، گەر ویستبێتیان، ڕۆڵەکانی گەلەکەی خۆیان، لە چارەسەرکردنی گرفتەکاندا بەشدارکەن، گەر ویستبێتیان، بە ڕێیەکی ئاشتییخوازانە، چارەسەری کێشەی نەتەوەکەی خۆیان بکەن، ئەوا، پەنایان بۆ بەر، پرۆسەی « ڕیفراندۆم » بردووە و پرسیان، بە ڕۆڵەکانی نەتەوەکەی خۆیان کردووە، وەک سەرکردەی گەلانی « نەرویژ، مەڵدۆڤە، ئەرتیریا، تەیموری خۆرهەڵات، لاتڤیا، لیتڤیا، ئیستۆنیا ... » کردیان.
ئاخر، سەرکردە دڵسۆزەکانی گەلانی ئازادیخواز و دیمۆکراسییخواز، نەک هەر بۆ کارێکی وا پیرۆز و پێویست، نەک هەر بۆ کارێکی وا گرنگ و چارەنووسسازانە، پەنایان بۆ بەر پرۆسەی « ڕیفراندۆم » بردووە، بەڵکوو تەنانەت، بۆ هێندێ بڕیاری کەم بایەختریش، هەر « ڕیفراندۆم »یان سازکردووە و پرسیان، بە ڕۆڵەی گەلەکانی خۆیان کردووە. بۆ نموونە:
کاتێ دەوڵەتێکی شانشینی دیمۆکراسیی وەک « سوید » ویستی، جێی خۆی لە « یەکیتی ئەورووپا »دا بکاتەوە، دەنگیان لە سەر دا و زۆربەی دانیشتووان، لەگەڵ ئەوەدا بوون، ببێ بە ئەندام. یا، کاتێ لێپرسراوەکانیان ویستیان، دراوی وڵاتەکەیان، لە « کرۆن ـ Kron »ەوە بۆ « ئیرۆ ـ Euro » بگۆڕن،

پرسیان بە ڕۆڵەکانی گەلەکەی خۆیان کرد و ڕۆژی « 15 .09 .2003 »، پرۆسەی « ریفراندۆم »ێکی دیمۆکراسیی ئازادانەی سەرتاسەرییان سازکرد، هەرچەندە، سەرانی هێندێ لە پارتە رامیارییەکانی « سوید »، زۆر حەزیاندەکرد، پارەکە بگۆڕن، بەڵام، چونکە زۆربە دەنگیاندا، پارەکە نەگۆڕن، هەر وەک خۆی مایەوە و هیچ دەسەڵاتێ نەیتوانی، ئەو پارە نوێیەیان بە سەردا بسەپێنێ!
کەچیی، سەرانی کورد، لە لایەکەوە، پێش ئەوەی، پرس بە ڕۆڵەکانی گەلی کورد بکەن، پرس بە سەرانی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی « کوردستان » دەکەن! لە لایەکی دیکەشەوە، یا پرس بە گەل ناکەن، بەڵکوو، ئەوەی خۆیان بیانەوێ، رایدەگەیەنن و دەیکەن، هەر وەک چۆن، ساڵی « 1992 »، بێ ئەوەی، پرس بە ڕۆڵەکانی گەلی کورد لە « باشووری کوردستان »دا بکەن، لە یەک لاوە و لە ڕێی پەرلەمانەوە، سیستێمی « فیدراڵیی »یان ڕاگەیاند! یا، گەر ڕۆڵەکانی گەل بیانەوێ، « ریفراندۆم »ێکی سەرتاسەریی و ئازادانە، لە سەر ئایندەی « کوردستان » و چارەنووسی گەلی کورد سازکەن، گەر بە هەموو توانایانەوە، دژایەتی نەکەن، ئەوا، بە دەیان گرفت و کۆسپیی لە ڕێدا درووست دەکەن، نایەڵن، سەرکەوێ. یا، گەر ماوەشیان دا، ئەوا، بۆ مەبەستی تایبەتیی و بەرژەوەندیی تەسکی پارتایەتیی خۆیان بەکاریدێنن، هەر وەک ئەو بزووتنەوەیەی، بە ناوی « بەرەو ریفراندۆم »ەوە، ڕۆژی « 13 .07 .2003 »، لە شاری « سولەیمانیی »، یەکەمین کۆبوونەوەی فراوانی خۆی گرت، چەندین « خوێندەوار، ڕووناکبیر، نووسەر، هونەر، مامۆستا، پارێزەر، ئەفسەر ... » بەشدارییان تێدا کرد.*
سەرەتا، هەر دوو پارتی فرمانڕەوا، هەڵوێستێکی باشیان لێ وەر نەگرت. پاشان، کاتێ زانییان، لە لایەکەوە، بزووتنەوەکە خەریکە، وردەوردە پەرەدەسێنێ، جێی خۆی، لە نێو ڕیزەکانی گەلی کورددا دەکاتەوە و ڕۆڵەکانی کورد، لە دەوری بەرنامەکەی کۆدەبنەوە، باوەشیان بۆ کردەوە. بەڵام، نەک بۆ ئەوەی، جوڵانەوەی « بەرەو ریفراندۆم »، ئامانجە سەرەکییەکانی خۆی بەدیبێنێ، بەڵکوو، ئەوەک لە پاشەڕۆژدا، گەورەتربێ و پارتێکی رامیاریی لێ بکەوێتەوە، ڕۆڵی سەرەکیی هەر دوو پارتی فرمانڕەوا و زلهێز کزولاوازکا. یا، تەنیا هەر بۆ ئەوەبوو، وەک کارتێکی گوشار، دژی دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق » بەکاریبێنن و بەرنامەی پارتەکانی خۆیانی پێ بەدیبێنن، بۆیە، ڕێژیان لە دید و بۆچوونی گشتیی خەڵکی « کوردستان » نەگرت، بزووتنەوەکەشیان، لاوازکرد و تاساندیان!

بەڵام، ئەوڕۆ لەوە دەچێ، هەر هەوڵیان ناچاربن، بایەخێکی تایبەتیی، بە بزووتنەوەی « ڕیفراندۆم » بدەن، بە تایبەتیی، دوای ئەوەی، کۆمیتەکانی بـــــزووتنەوەکە توانییان، نزیکەی دوو ملیۆن واژوو، لە نێوەوە و دەرەوەی « کوردستان » کۆکەنەوە، لە ڕێی نوێنەرەکانیانەوە، ڕۆژی « 22 .12 .2004 »، ســەردانی بارەگــەی « کــۆمــەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکــان » بکەن و لەگــەڵ نوێنەرەکانیاندا کۆبنەوە. بڕیاریش وایە، ڕۆژی « 05 .01 .2005 »، جارێکی دیکە، لە « ژنێف »، لەگــەڵ نوێنەری نەتەوە یەکگرتووەکــاندا کــۆبنەوە. ئەم چالاکیی و هەنگاوە گەورانە، گور و تینێکی باشیان، بە بزووتنەوەکە داوە.
بە ڕاستیی، گەر هەمو لایەک یەکبن، هەوڵێکی بە کوڵ بدەن و خەباتێکی چڕ و پڕی بۆ بکەن، ئەنجامێکی باشی لێ دەکەوێتەوە. ئاخر، ئەوڕۆ کاتی ئەوە هاتووە، ڕۆڵەکانی گەلی کوردیش، وەک ڕۆڵەی هەموو نەتەوەکانی دیکەی سەر ڕووی زەوی، دید و بۆچوونی تایبەتیی خــۆیان دەربڕن، بڕیار لە ســـەر چارەنووسی خــۆیان و ئایندەی « کــوردســتــان » بدەن، چی دیکە، بە ژیانی کۆیلەیی و نۆکەریی قایل نەبن، کۆمەڵگەیەکی ئازاد و نیشتمانێکی سەربەخۆ دامەزرێنن. چونکە، مرۆ بە ئازادیی لەدایکدەبێ، دەبێ، هەر بە ئازادیی بژی و بە ئازادییش بمرێ. بۆیە، هەمــوو مــرۆڤێ بۆی هەیە، چۆنی دەوێ، هەر بەو شێوەیە بژی!
ئاشکرایە، مافە نەتەوەیی و رامیارییەکانی هەمــوو گەلێ، یا نەتەوەیەکی دیاریکراو، بە شتێکی زۆر پیرۆز دادەنرێ. لەبەرئەوە دەبێ، ئەو مافــانە، لە ســـەروو هەمـــوو شـــتێکی دیکەوە دانرێ. ئێمـــە نابێ، گـــوێ بەوە بدەین، سەرکردەی هەر دوو پارتی دەسەڵاتدار: « بارزانیی » و « تاڵەبانیی » چییان دەوێ؟ دروشمیان چییە؟ یا چی دەڵێن و چی دەکەن؟ چونکە، ئەوە داواکاریی ئەوان و پارتەکانیانە. بەڵام، هەمیشە دەبێ، داواکاریی ڕۆڵەکانی گەل، لەگەڵ داواکاریی ئەواندا، جیاوازیی هەبێ. بۆیە دەبێ، داواکاریی جەماوەری گەل، لە داواکاریی ئەوان، گەورەتر و پیرۆزتربێ!
ئاخر، ئەوان ئەوەتەی هەن، هەوڵدەدەن، قەڵای قایمی مێشکی ڕۆڵەکانی گەل داگیرکەرن، چییان بــــوێ، ئەوەی تێدا بچێنن. خۆ مێشکی ڕۆڵەکانی گەل، « کەپکی حەمەد ئاغا » نییە، هەر جارەی بە نۆرە، لایەکیان داگیریکەن و پەرەڵاویکەنەوە! جەماوەری گەل دەبێ، خاوەنی مێشکی ئازادی خۆیان بن، خۆیان لە داگیرکردن، چەوساندنەوە و داپڵۆسین ڕزگارکەن.
لە ڕاستییدا، سەرکردایەتی ئەو دوو پارتە، نوێنەری پارتەکانی خۆیان نەبێ، نوێنەری گــەلی کــورد نین. چونکە ناتوانن، یا نایانەوێ، وەڵامی گــوتار و

لێدوانەکانی سەرانی دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق » بدەنەوە، کاتێ، هەڕەشە لە کورد دەکەن، سووکایەتی پێ دەکەن، یا ڕۆڵەکانی تیرۆردەکەن. لەوە دەچێ، سەرکردایەتی هەر دوو پارت، بەو لێدوانە شۆڤێنیستانەیەی « شێخ یاوەر » قایلبن، بۆیە، دەنگیان لێوە نەهاتووە! ئەدی چۆن قایل نەبن، خۆ ئەوانیش، لە عەرەبەکان پتر، داوای پاراستنی یەکێتی خاکی « عێراق » دەکەن، پتر لە عەرەبەکان، دژی سەربەخۆیی و دامەزراندنی دەوڵەتێکی « کوردستانیی » وەستاون. لە سەرەتاشدا، پتر لە « یاوەر »، دژی « ڕیفراندۆم » بوون!
بۆیە، ئێستەش باوەڕم بە سەرکردایەتی ئەو دوو پارتە نییە، بۆ سەربەخۆیی « کوردستان »، پشتگیریی بزووتنەوەی « ڕیفراندۆم » بکەن، بە تایبەتیی، دوای ئەوەی، « جەلال تاڵەبانیی »، ڕۆژی « 24 .12 .2004 »، لە وەڵامی پرسیارێکی بەرنامەی « عالەم ئەلئان »ی ڕادیۆی « ساوا »دا، دەربارەی سەردانی نوێنەرەکانی بزووتنەوەی « ڕیفراندۆم » بۆ دەرەوەی وولات، زۆر بە ڕاشکاویی گوتی: (ڕیفراندۆم واتای بانگەواز نییە بۆ جیابوونەوە، بەڵکوو، بۆ دیاریکردنی شێوەیەک لە شێوەکانی فیدرالییەتە و ئێمە، هەرگیز نامانەوێ، لە « عێراق » جیابینەوە.)1*
دەبا، « ڕیفراندۆم »ێکی گشتیی وەک کۆڕەوەکەی ساڵی « 1991 »، بۆ سەربەخۆیی تەواوی « کوردستان » سازکەین و هەموو پێکەوە، بڕیار لە سەر چارەنووسی گەلەکەمان بدەین. چونکە کۆڕەوەکە، « ڕیفراندۆم »ێکی میللیی خۆڕسکیی گەلی کوردی « باشووری کوردستان » بوو، دژی گەڕانەوەی داگیرکەری دەوڵەتی « عێراق » سازکرا!

* * *

---

تێبینیی و سەرچاوە:

* هەر زۆر زوو، هەستم پێ کرد، « ڕیفراندۆم »، گەمەیەکی نوێ نەبێ، هیچی دیکە نییە. چونکە، سەرانی « یەکێتیی » دەیانویست، پرۆسەی « ڕیفراندۆم »، وەک کارتێکی گوشار، بەرانبەر عەرەبەکانی « عێراق » بەکاربێنن. تا، دان بەو « فیدراڵیی »یەدا بنێن، کە خۆیان دەیانەوێ! بۆیە لە « کوردستان » تەنیا هەر، لە یەکەمین کۆبوونەوەدا بەشدارییمکرد و کۆڕێکی ڕاستەوخۆشم، لە سەر تێلێفیزیۆنی « زەحمەتکێشان » سازکرد. لە « سوید »یش، هەر لە ڕێی ڕادیۆی کوردیی « زرێبار » و گوتارنووسینەوە، بەشدارییم تێدا کرد. ئەویش لەو باوەڕەوە، گەر لەم قۆناغەی خەباتدا، بۆ چەسپاندنی سیستیمی « فیدراڵیی »ش بێ، هەر خراپ نییە!

1* سامان کەریم، بزووتنەوەی ڕیفراندۆم فریوتاندەدات. ئاگادارین! **Kurdistanpost**، ڕۆژی 25 .12 .2004

# « کورد » و « فەلە »

لە کاتێکدا، ڕۆژی « 2004. 08. 02 »، کەناڵی « ئەلشەرقیە » ڕایگەیاند، تیرۆریستە عەرەبەکانی « عێراق » و وڵاتانی دیکەی موسوڵمان، لە شاری « بەغدا » و « مووسڵ »، چەن « کڵێسە »یەکیان تەقاندۆتەوە، کۆمەڵێ خەڵکی فەلەی بێ تاوانیان کوشتووە، زۆربەی ڕێکخراو و دەوڵەتەکانی جیهان، چ عەرەبیی، چ ئیسلامیی و چ بیانیی، دەنگی ناڕەزایی خۆیان بەرزکردەوە، تووڕەیی و بێزاریی خۆیان دەربڕی.
هەر بۆ نموونە: لە پێش هەموویانەوە، « زانکۆی دەوڵەتە عەرەبییەکان »، بڵاڤۆکێکیان دەرکرد و ئەو کارەیان ڕیسواکرد. « ڕێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامیی » دژ وەستان. « شالیاری دەرەوەی لوبنان »یش گوتی: (دەستدرێژییکردنە سەر کڵێسەکان، جگە لە « ئیسرایل »، ڕاژەی بەرژەوەندیی کەسی دیکە ناکا.)«1»
هەروەها، پیاوانی ئایینیی، چ سوننە و چ شیعە، لە هەموو جیهانی ئیسلامەوە، وەک بێچووە قاز قیراندیان، هەموو بە یەک جار، دەنگیان لێ هەڵبڕی و دڵتەنگیی خۆیان دەربڕی. تەنانەت یەکێکی وەک « موفتە»دا سەدرە»ی نەزان و گێرەشێوێنیش، خۆی بۆ نەگیرا و گوتی:( دەستدرێژییکردنە سەر فەلەکان، دەستدرێژییکردنە سەر هەموو عێراقییەکە، لەبەرئەوەی لە بنەڕەتدا عێراقیین و هێرشکردنە سەر کڵێسەکان، جگە لەوەی دەیانەوێ، بەردەوام خوێنی عێراقیی برژێ، هیچی دیکەیان ناوێ.)«2»
هەروەها، سەرۆک کۆماری کاتیی « عێراق » شێخ « یاوەر »، سەرۆک شالیاران « عەلاویی » و جێگرەکانیشیان، قسەی خۆیان کرد و داخی دڵی خۆیان هەڵڕشت.

کەچیی، کاتێ عەرەبە موسوڵمانە « بەعسیی »یەکان، شارۆچکەی « هەڵەبجە » و چەن نێوچەیەکی دیکەیان وێرانکرد، دانیشتووانە کوردە موسوڵمانەکەیان، لە دووکەڵی گازی کیمیاوییدا نقوومکرد، بە ژاری « خەردەل » و « سیناەید »، هەناسەیان لێ برین و کۆرپەی سەر بێشکەیان تاساندن، نزیکەی « 5.000 » کوردیان، بە بای مەرگی کیمیاویی خنکان، موسوڵمانەکانی جیهان و برا عەرەبەکانی کورد، دەنگیان لێوە نەهات!

کاتێ، عەرەبە موسوڵمانەکان، « 4.500 » گوندیان، لەگەڵ زەویدا تەختکرد، دانیشتووانە کوردە موسوڵمانەکانیان، بۆ هۆردوگا زۆرەملێییەکان گواستەوە، چواردەوریان گرتن، وەک ئاژەڵ هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکردن، هیچ جۆرە ئازادیی و ژیانێکیان پێ ڕەوا نەدەبینین، دەستیان بۆ ئابڕووی کیژ و ژنانی کورد دەبرد، نەک هەر دەنگ لە کەسەوە نەهات، بەڵکوو، بە کارێکی باشیشیان دادەنا، گوایە: « عێراق »، گوندی هاوچەرخ درووستدەکا و بنکەی کشتوکاڵیی گەورە دادەمەزرێنێ! «3»

کاتێ عەرەبە موسوڵمانەکان، بە ناوی سووڕەتی « ئەنفال »ەوە، « 182.000» کوردی موسوڵمانی بێ دەرەتانیان، لە زێد و نیشتمانی خۆیان دوورخستەوە، گوندەکانیان ڕوخاندن، پیاوانیان لە ژنان جیاکردەوە، سەر وماڵیان تاڵان و « ئەنفال » کردن، بێ سەروشوێن مانەوە، جگە لە چەن دەنگێکی کزولاواز نەبێ، یەک مرۆڤی وڵاتانی عەرەب و ئیسلامیی، یەک ڕێکخراو و دەوڵەتی موسوڵمان، دەنگیان نەکرد، وەک کورد گەلێکی گاووڕبێ، « پەیامبەر » زیندوویبووبێتەوە و بڕیاری بۆ لەشکرەکەی دەرکردبێ، پەلاماری ئەو گەلە گاووڕە بدەن، سەر و ماڵی « ئەنفال » کەن!

کاتێ، « 8.000 » ژن و منداڵ، پیر و پەککەوتەی هۆزی « بارزان »یان، سواری شەمەندەفەری مەرگ کرد و هەموویان کوشتن، کەس هاوارێکی موسوڵمانانە و مرۆیانەی لە دەم نەبیستن!

ئەدی بۆ دەبێ، کاتێ چەن ترۆمبێلێ، لە بەردەم چەن « کڵێسە »یەکدا بتەقێندرێتەوە، هەر عەرەبە موسوڵمانەکان خۆیان، پێش فەلەکانی جیهان، بە هاوارهاوار و هاژەهاژ، گوێی هەموو جیهان کەڕکەن؟!! سەری جیهانیان لێ بێنەوە یەک، مەترسییەکی گەورەی، بۆ سەر پاشەڕۆژی دەوڵەتی « عێراق »، نەتەوەی « عەرەب » و ئایینی « ئیسلام »یش هەبێ؟!! کەچیی، هەر هەمان عەرەبی موسوڵمان خۆیان، نزیکەی « 5.000 » مزگەوت بڕوخێنن، پتر لە یەک میلیۆن « قورئان » بسووتێنن، بە هەزاران مەزارگەی پیر و پیاوچاکانی موسوڵمانی کوردیش، لەگەڵ زەوییدا تەختکەن، یەک موسوڵمانیش نەبێ،

دەنگی نارەزایی بەرزکاتەوە، دژی ئەو کارە چەپەڵە بوەستێ، لەگەڵ ئەوەشدا، هیچ زیانێکیشی، بۆ سەر ئایندەی دەوڵەتی « عێراق »، نەتەوەی « عەرەب » و ئایینی « ئیسلام »یش نەبێ؟!!
بە ڕاستیی، ئەمە تەنیا هەر لەوە دەچێ، ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد، بە زۆر، خۆیان بە ئایینی ئیسلامدا هەڵواسیبێ. ئەگینا، گەر لە هەموو جیهانیشدا قڕکرێن، کێ بە دەنگیانەوە دێ و لە سەریان هەڵدەداتێ، وەک ئەو موسوڵمانە عیار بیستوچوارانەی، لە سەر گەلانی موسوڵمانی « فلەستین، کشمیر، بۆسنە، چیچین، کۆسۆڤۆ ... » هەڵدەدەنێ؟!! چونکە، ئەوان بە هەموو شێوەیە، یارمەتیی ئەو گەلە موسوڵمانانە دەدەن! بەڵام، لەوە دەچێ، کورد بە موسوڵمان نەزانن، بۆیە، هەر خۆیان هەوڵی لەنێوبەردنی دەدەن و خوێنی حەڵاڵدەکەن، وەک « خومەینیی »، غەزای دژی کورد ڕاگەیاند!
کەچیی، کاتێ پێویستیان، بە ڕۆڵەکانی گەلی موسوڵمانی کورد بووە، تا، چڵەکەی سەر داری دوژمنیان بۆ بگرن، پێش سوپاکانی خۆیانیان خستوون، وولاتانی گەلانی دیکەی جیهانیان پێ داگیرکردوون، ئینجا، تەنیا هەر ئەو کاتە، ڕێزێکی زۆریان لێ گرتوون و لە خۆیان بە موسوڵمانتریان داناون! چونکە ویستوویانە، بەو مقاشە گەورە و درێژانەی کورد، پشکۆی گەورە و گەرمی نەیارەکانی خۆیان بگرن، جەنگاوەرانی کوردیش، بەو پەڕی دڵپاکیی، دڵسۆزیی، بە ئەمەکیی و ئازایی خۆیانەوە، بۆ ئەو دەسەڵاتدارە خوێنڕێژانەی جێنشین و سوڵتانەکانی « ئەمەویی، عەبباسیی و عوسمانیی » جەنگاون، قوربانییەکی زۆریان داوە، خوێنێکی زۆریان ڕشتووە، هەر وەک چۆن ئەوڕۆ، چەندین کوردی سەرلێشێواو، خەڵکێکی بێ هەست و هۆشی نەتەوەیی، بە ناوی ئایینی ئیسلامەوە، دژی ڕۆڵەکانی نەتەوە و خاکی نیشتمانەکەی خۆیان، لە ڕیزی ڕێکخراوە موسوڵمانە توندڕەو و بەرگیرەکاندا کاردەکەن، تێدەکۆشن، دەجەنگن و گیانی خۆیان، لە پێناوی نەتەوەی عەرەب و ئایینی ئیسلامدا بەختدەکەن، وەک ئەوەی، کورد نەتەوە نەبێ، هەموو مافە ڕەواکانی خۆی بەدەسهێنابێ، نیشتمانەکەی لە دەس « توورک، فارس و عەرەب » ڕزگار کردبێ! یا، وەک ئەوەی عەرەبەکان، کورد بە گەلێکی موسوڵمانی سەربەخۆ بزانن، زۆر ڕێز لە ویست و ئارەزووەکانی بگرن!
بەڵام، کاتێ کورد، داوای مافە ڕەواکانی خۆی کردووە، ئەوا عەرەبێکی فەلە، یا فەلەیەکی بیانیی، لە کوردێکی موسوڵمان لە پێشتر، خۆشەویستتر و باشتربووە. لەبەرئەوە، لە کۆندا، هەمیشە کوردیان بە « گێرەشێوێن، تێکدەر، ئاژاوەچیی، ڕێگر، دز و جەردە » نێوزەدکردووە، ئێستەش، قەوانێکی دیکەی

بۆ لێدەدەن و بە نۆکـــــــــەری « ئیسرایل »، بەکرێگیراوی ئیمپریالیزمی « ئەمێریکا » و بەرەی خۆراوای دادەنێن!
جا، ئەم کارە دڕندە و نامرۆڤانانەیەی عەرەبە موسوڵمانەکان، بەرانبەر بە کورد لە مێژوودا کردوویانە، ئێستەش، هەر بە بەردەوامیی دەیکەن، هۆکەی هەرچی بووبێ و هەرچییەک بێ، گرنگ نییە. چونکە، وا دیارە، ڕۆڵەکانی کورد، بە مرۆڤ و « عێراقیی » نازانن، بە موسوڵمانیان دانانێن، بەڵکوو، بە بڕبڕەی پشتی دوژمنە گەورەکەیانی « ئیسرایل » دەزانن! ئاخر، هەر هەمان ئەو عەرەبانەن، ئەوڕۆ، داکۆکیی لە فەلە و « کڵێسە »کانیان دەکەن، کەچیی، دوێنێ، داکۆکییان لە کوردە موسوڵمان و مزگەوتەکانیان نەدەکرد! تۆ بڵێی، کورد هێندە مەترسیی، بۆ سەر نەتەوەی عەرەب و ئایینی ئیسلام زۆربێ، وا بە ئاشکرا، تۆویبڕیدەکەن، کەسیش لە سەری هەڵ ناداتێ و خۆی بە خاوەنی نازانێ؟!!
بە ڕاستیی، گەر ڕۆڵەکانی هەر نەتەوەیەک بە گشتیی، نەتەوەیەکی بندەس و چەوساوە بە تایبەتیی، یادەوەریی نەتەوەییان، هێندە کزولاوازبێ، ئەو هەموو « داگیرکردن، دابەشکردن، زۆرداریی، کوشتنی بە کۆمەڵ، وێرانکردن، ڕوخاندن، سووتاندن، تالانکردن، ئابڕووبردن و لەنێوبردنانە »یان بیر نەبێ، یا بە دەسی ئانقەست، لە بیر خۆیانی بەرنەوە، زۆر بە ڕاشکاویی دەڵێم: دەبێ، ئەو نەتەوەیە، لە ڕووی سایکۆلۆژیی و مەڕاڵەوە، کەموکووڕییەکی گەورەی هەبێ، نەتەوەیەکی نەخۆش و پەککەوتە بێ، پێویستە، چارەسەرێکی خۆی بکا، نەک تەنیا هەر، سەرکۆنەی دوژمن و داگیرکەرانی نیشتمانەکەی بکا!

* * *

---

1. الاعتداء على الكنائس في العراق لا تخدم سوى مصالح اسرائيل.
2. الاعتداء على المسيحيين هو اعتداء على كل العراقيين لانهم بالاساس عراقيون و ان الهجوم على الكنائس لا يراد منه سوى استمرار نزيف الدم العراقي.
3. گەر تەماشایەکی پەرتووکی وولاتانی جیهانی « یەکێتیی سۆڤێت » بکەین، ئەو چەن مرواریی و گەوهەرانە دەخوێنینەوە!

# « کورد » و « جوو »

لەو ڕۆژەوە، دەوڵەتی « ئیسرایل » دامەزراوە، لە هەموو جیهانەوە، بەرەبەرە، « جوو » ەکان، بۆ وڵاتەکەی خۆیان دەگەڕێنەوە، خانوو دروستدەکەن، کاردەکەن، خۆیان فێری زمانی « عیبریی » دەکەن، منداڵەکانیان، بە شیری بیری « جوولەکایەتیی » پەروەردەدەکەن، بە هەموو شێوەیە، داکۆکیی لە سەر و ماڵی خۆیان و هاووڵاتییانی دەوڵەتەکەیان دەکەن. بۆیە، بەو شێوەیە، « 5 » ملیۆن « جوو »، بەرانبەر نزیکەی « 300 » ملیۆن عەرەب و پتر لە یەک ملیار موسوڵمان ڕەستاون و ماون، تا ئەورۆ، بەرگەیانگرتووە، زۆر بەهێزن و لە هەموو ڕوویەکیشەوە، لە عەرەب پێشکەوتووترن! چونکە، زۆر مەردانە، دژی دوژمنەکانی خۆیان دەجەنگن، بۆ ئایین، ڕۆڵەکانی گەلی « جـــوو » و دەوڵەتی « ئیسرایل »، زۆر دڵسۆز و بە ئەمەکن، بەرژەوەندیی باڵای گەلەکەی خۆیان و دەوڵەتەکەیان، پێش هەموو جۆرە، بەرژەوەندییەکی تەسکی ڕەگەزیی و پارتایەتییەوە داناوە!
بەڵام، وا نزیکەی « 60 » ساڵ دەبێ، عەرەبەکان بە گشتیی، ڕۆڵە و سەرکردەکانی گەلی « فلەستین » بە تایبەتیی، هەر هاواردەکەن، دەقیرێنن، جنێودەدەن، هەڕەشەدەکەن، گوایە: « جوو » ەکان، فڕێدەدەنە نێو زەریاوە، خۆیان کۆدەکەنەوە، کۆبوونەوە دەکەن، کۆنگرەی لوتکەی « دەوڵەتە عەرەبییەکان » دەگرن، پەلاماردەدەن و جەنگ بەرپادەکەن، کەچیی، لەگەڵ ئەوەشدا، هەر « جوو » ەکان سەرکەوتوون و « عەرەب » ەکانیش ژێرکەوتوون!

ئەدی گەر کورد، لە گەڵ « جوو »ەکاندا بەراوردبکەین، بەرانبەر ڕۆڵەکانی خۆی و نیشتمانەکەی چۆن ڕەفتاردەکا؟ ئاشکرایە، کاتێ « باشووری کوردستان » ئازادکرا، سوپای دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق » کشایەوە، میریی دەسەڵاتی ئەما، هەموو دەزگەکانی « بەعس » و بەڕێوەبەرێتییە « سیخووڕیی »ەکانی پێچڕانەوە، لەبری ئەوەی، پۆلپۆل، کوردی پەڕیدەی هەندەران بگەڕێنەوە، وڵاتەکەی خۆیان ئاوەدانکەنەوە و بەرەو پێشەوەی بەرن، دەستەدەستە و کۆمەڵکۆمەڵ، خانوو و کەرەسەی نێو ماڵی خۆیان تاڵانفرۆشکرد، قەرزوقۆڵەیەکی زۆریان کرد، دەسی ئەم و ئەویان ماچکرد، پاڕانەوە و لالانەوە، تا، ڕێیانبدەن، لە سنوور بپەڕنەوە، پارتەکانی « کوردستان »یش، نەک هەر ڕێیان لێ نەگرتن، بەڵکوو، خۆیان هانیاندەدان و پارەیەکی باشیشیان دەسکەوت! جگە لەوەی، کاتێ دەریشدەچوون، دەیان کارەساتی ناخۆش، بەرۆکی دەگرتن، بە دەیان کاری ناشیرینیان دەکرد، تووشی چەندین گرفتی « برسێتیی، تینوێتیی، ماندووبوون، گرتن، لێدان، دەسبڕین، ڕووتکردنەوە و گەڕانەوە »ش دەبوون، کەچیی هێشتا، هەر لە سەر هەڵاتن و بەجێهێشتنی نیشتمانەکەی خۆیان، بەردەوامبوون و کۆڵیان نەدەدا! *
ئاخر، کورد بەو چەشنە دەیەوێ، « کوردستان »ێکی ئازاد دامەزرێنێ و گەلێکی بەختیار دروستکا؟!! خۆ « جوو »ەکان بە خۆڕایی، ئەو دەوڵەتە بچووکە خاوەن دەسەڵاتە بەهێزە زانستانەیەیان دا نەمەزراندووە، بەڵکوو، هەوڵێکی زۆریان داوە، گەلێ ماندووبوون و خوێنێکی بێ ئەندازەشیان ڕشتووە، تا، بەم ڕۆژە گەشە گەیشتوون.
خۆزگە، شالاوی ئەو کۆچڕەوە دەرەستا، چی دیکە، ڕۆڵەکانی کورد، نیشتمانەکەی خۆیان چۆڵ نەدەکرد، چی دیکە، لەوە پتر، سووک و ڕیسوا نەدەبوون!
خۆزگە، کۆچی پێچەوانەی پەنابەرانی کورد بە گشتیی و خاوەن بەهرەدارەکان بە تایبەتیی، لە وڵاتانی هەندەرانەوە، بەرەو « کوردستان » دەسپێدەکرد!
خۆزگە، سەرکردەی پارتە دەسەڵاتدارەکانی « باشووری کوردستان »یش، چارەسەرێکی بنەبڕییان، بۆ ئەو گرفتە گەورەیە دەدۆزییەوە!

* * *

**تێبینیی :**

* جگە لەوەی، « مەحموود گەرگەریی »، لە « قامیشلیی » بۆی گێرامەوە، چۆن ژنانی کورد، لەو بەر ئاوەکەی نێوان « زاخۆ » و « سووریا »وە وەستاون، تا پەڕینەوە، دەپاڕێنەوە و بەڵێنی جووتبوونێکی خۆش، بەو کەسانە دەدەن، دەیانپەڕێننەوە!
ئەوەی لە وڵاتی « گریک »یش، لە هێندێ کورد رووی‌داوە، مرۆ، هەر کوردی لە بەر چاو دەکەوێ! دەگێڕنەوە، باوک کچ ، برا خوشک و مێرد ژنی خۆیان، بە هەرزان فرۆشتووە، تا ، پارە پەیداکەن و پێی دەرچن. کەم نەبوون، ئەو ژن و کچانەی، لە گۆڕەپانی « ئامۆنیا »ی شاری « ئەتێن » وەستابوون و بە پارە، لەشی خۆیان دەفرۆشت! مەگەر هەر خوا بۆ خۆی بزانێ، لە هۆردوگاکانیش، چییان بەسەرهاتووە!
گەر، هەر کەسێ، چاوێ بەو دوو گۆتارەی « کورد و دیموکراتی »ی « پێشڕەوان »دا بخشێنێ، ئینجا، بۆی دەردەکەوێ و تێدەگا، « کلۆپ، فڕێن و دەرمان » چی دەگەیەنێ!

ئەو چەن دێڕەی سەرەوەم، لەگەڵ گۆتارەکەدا بڵاوکردبۆوە، هێندێ کەس، بە هەڵە لە مەبەستەکانم تێگەیشتبوون. جا بۆ ئەوەی، لە ئایندەدا، کەسی دیکە بە هەڵە، لە مەبەستەکانم تێ نەگا، لێرەدا، زۆر بە ڕاشکاویی دەڵێم: کاتێ نووسیوومە، « ژنانی کورد »، دیارە، مەبەستم لە هەموو ژنانی کورد نەبووە و نییە، بەڵکوو، هێندێ لەو ژنانەی، ملی ڕێی کۆچیان گرتبوو، لە رێ لێیان قەوماوبوو، ئەو کارانەیان کردبوو. هەڵبەتە، چەم بێ چەقەڵ نابێ، لە نێو کۆمەڵگەی کوردیشدا، وەک هەموو کۆمەڵگەیەکی دیکە، ژنی بێ ڕەوشتی تێدا هەیە. بەڵام، لەوە دەچێ، ئەم قسەیە، بە زۆر کەس هەرس نەکرێ! ئەگینا، ڕێزێکی زۆرم، بۆ ژنانی کورد هەیە!
ئەوەی لە وڵاتی « گریک »یش ڕوویداوە، درۆی تێدا نییە و هێندێ خێزان، ئەو کارەیان کردووە. تەنانەت ئێستەش، هێندێ لەو ژنانە، هەر لەوێ دەژین و ئەو کارانە دەکەن. بۆچی ئەوڕۆ، ئەو جۆرە ژن و ئەو کارە خراپانە، لە شارەکانی « کوردستان »، کەمن؟!!
جگە لەوەی، « کلۆپ، فڕێن و دەرمان »، قسەی من نین و لە هەر دوو گۆتاری « کورد و دیموکراتی » لە « Kurdistanpost »دا خوێندوومنەتەوە، تا ئەوەشم نەخوێندبۆوە، ئەو شتانەم نەبیستبوو، بەڵام، باوەڕی پێ دەکەم!
ئەز، هەرگیز مەبەستم ئەوە نەبووە و نییە، سووکایەتی بە هیچ کوردێ بکەم. تەنیا هەر هێندە هەیە، باسی ئەو گرفتە گەورە و ڕووداوە ناخۆشانەم کردووە، کورد و جووەکانم، بەراوردکردووە، داواشم لە کەس نەکردووە و ناشیکەم، بۆ « کوردستان » بگەڕێتەوە، چونکە، هەموو کەس ئازادە، چۆن دەژی، لە کوێ بیەوێ، بژی!

# هەلی مێژوویی

سەرکردە بلیمەت و دڵسۆزەکانی گەلانی جیهان بە گشتیی و گەلە ژێر دەستەکان بە تایبەتیی، هەمیشە، بیریان لەوە کردۆتەوە، چۆن ئامانجە نەتەوەیی و رامیارییەکانی خۆیان بەدیبێنن. لەبەرئەوە، ئەو پلانانەی دایانناوە و نەیانتوانیوە، لە رێی دیالۆگ، دانوستان و یاسای نێودەوڵەتییەوە بەئەنجامیانبگەیەنن، یا، ئەو ئامانجانەی خەونیان پێوە دیوە و نەیانتوانیوە، بە ئاسانیی بەدییانبێنن، یا، ئەو مەرجە قورسانەی هەیانبووە و نەیانتوانیوە، بە سەر نەیارەکانی خۆیانیاندا بیانسەپێنن، هەمیشە، چاوەڕێی هەلێکی مێژووییان کردووە، بۆ ئەوەی، گرفت و لاوازیی نەیارەکانیان بقۆزنەوە. بۆیە، هەرگیز هەلی مێژووییان، لەکیس خۆیان نەداوە، هەر کە هەلەکەیان بۆ رەخساوە، سەرەتا، لە رێی کەناڵەکانی دیپلۆماسییەوە، داوای مافەکانی خۆیان کردووە، گەر دوژمنەکانیان، دانیان پێدا نابێ، ئەوا، بە شێوەیەکی ئاشتیخوازانە، کۆتاییان، بە هەموو گرفتەکانی نێوانیان هێناوە. بەڵام، گەر دوژمنەکانیان، هەر لە سەر کەللەرەقیی خۆیان سووربووبن، ئەوا، بەلاماریانداون و بەهێزی چەک، مەرجەکانی خۆیانیان بە سەردا سەپاندوون، یا، زیانێکی گەورەیان پێ گەیاندوون و بۆ ماوەیەکی دوورودرێژیش، سەر پێی خۆیان نەکەوتوونەتەوە.

ئەم جۆرە پرینسیپە گرنگە، وەک یاسایەکی گشتیی، گەمەی رامیاریی و دیپلۆماسیی نێوان دەوڵەتان، ئەوەتەی دەوڵەتەکانی جیهان دامەزراون، بەرژەوەندیی نەتەوەیی و ئابووریی جیاواز، لە نێوانیاندا پەیدابووە، لە نێوان هەموو میرنشین، دەوڵەتە بچووک و ئیمپرتۆریاکانی جیهاندا هەبووە و هەیە، تا، یەک دەوڵەتیش لە جیهاندا بمێنێ، ئەم گەمەیەش هەر دەمێنێ. سەرکردەی بنەماڵە، خێڵ، گەل، نەتەوە و دەوڵەتەکانی جیهانیش، زۆر بە وردیی پیادەیانکردووە، کەڵکیان لەم گەمە گرنگە وەرگرتووە و وەریشیدەگرن.

بۆ نموونە: ئەوەتەی دەوڵەتی « ئیسرایل » دامەزراوە، زۆربەی رامیار و لێپرسراوەکانی میریی، هەر کاتێ زانیبێتیان، دزێ لە یەکێتیی ڕیزەکانی نەتەوەی عەرەب کەوتووە، دەوڵەتە عەرەبییەکان یەک نین و وەک جاران ناتوانن، گەلەکۆمەکیی لە « جوو »ەکان بکەن، سوپا کۆکەنەوە، جەنگ ڕاکەیەنن و پەلاماریان بدەن، ئەوا، بە هیچ جۆرێ، یەک و دوویان لێ نەکردووە، لە هەر شوێنێ بووبێ، دەسیان لە دوژمنەکانی خۆیان وەشاندووە، سەرکردەکانیان خەڵتانی خوێن کردوون، پەلاماری بارەگەی ڕێکخراو و هێزە چەکدارەکانی « فلەستین »یان داوە و لێیان کوشتوون. هەر وەک چۆن، ڕۆژی « 1972. 04. 10 »، لە نێو جەرگەی شاری « بێرووت »دا، پەلاماری بارەگەی « ڕێکخراوی ئەیلوولی ڕەش »یان دا، چەن سەرکردەیەکیان لێ کوشتن و دەسیشیان، بە سەر هەموو دەکومێنتە نهێنییەکانیاندا گرت!
یا، گەر یەکێ لە دەوڵەتە عەرەبییەکان، تووشی بەڵایەکی نێوخۆیی بووبێ و سەر هیچ جۆرە کارێکی دیکە نەپەرژابێ، وەک گرفتی نێوان « قاعیدە » و سەرانی « شانشینی عەرەبستانی سعوودیە »، ئەوا ڕۆژانە، دەستێکی باشیان لە سەرکردە و چەکدارە چالاکەکانی ڕێکخراوەکانی « حەماس » و « جیهاد » وەشاندووە، وەک تری بن گۆمیش ڕۆشتوون و هیچیشیان پێ نەکراوە!
یا، گەر دەوڵەتێکی بەهێزی عەرەبیی، بە جەنگێکی دەرەکییەوە خەریکبووبێ، وەک جەنگی نێوان « عێراق » و « ئێران »، یەکسەر بە فڕۆکە، هێرشیان بۆ سەر وڵاتەکەی کردووە، وەک ئەوەی، هەلی ئەو جەنگەی نێوان ئەو دوو دەوڵەتە دوژمنەیان قۆزتەوە، ڕۆژی « 1981. 06. 07 » پەلاماری بنکەی ئەتۆمیی « بەغدا »یان دا و بۆمبارانیانکرد.
یا، گەر یەکێ لە دەوڵەتە عەرەبییەکان، لە لایەن دەوڵەتێکی دیکەی گەورەوە، لێی درابێ و خاکەکەی داگیرکرابێ، وەک چۆن هێزەکانی « ئەمێریکا » و هاوپەیمانەکانی، لە « عێراق »یان داوە و داگیریانکردووە، زۆر بە گەرمیی، دەسیان لە سەرکردە و ڕۆڵەکانی گەلی « فلەستین » وەشاندووە!
واتە: هەرگیز، هەلیان لە کیس خۆیان نەداوە، کەی دوژمنەکانیان، سەریان قاڵبووبێ، لاوازبووبن و توانایان نەبووبێ، داکۆکیی لە خۆیان بکەن، زۆر بە توندیی و دڵڕەقانە، پەلاماری نەیارەکانی خۆیان داوە، مەرجەکانی خۆیانیان، بە سەردا سەپاندوون و سەرکەوتنیان بە دەسهێناوە.
کەچیی، هەر کاتێ دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق »، لە مەترسییدا بووبێ، سەرانی کورد لە « باشووری کوردستان »، نەک هەر هەلەکەیان، لە دەس خۆیان و کورد داوە، نەک هەر پەلاماری دوژمنەکەیان نەداوە، بەڵکوو،

نژایەتییان نەکردووە، جەنگەکەیان وەستاندووە و پارەتیشیانداوە، تا، سەرێتی خۆی کەوتۆتەوە و لەو بەلا گەورەیە قورتاربووە. پاشان، پەلاماری ڕۆڵەکانی کورد و خاکی « کوردستان »ی داوەتەوە، بە خراپترین شێوە، لێیداون و چەوساندوونێتیەوە. وەک چەندین جار، لە مێژوودا ڕوویداوە.
بۆ نموونە: « مستەفا بارزانیی »، لە سەر داواکاریی عەرەب بووبێ، یا، بە خواێشتی خۆی بووبێ، لە هەموو جەنگەکانی نێوان عەرەب و « ئیسرایل »دا، لە گەرمەی جەنگی نێوان کورد و سوپای داگیرکەری دەوڵەتی « عێراق »دا، ئاگربەستی ڕاگەیاندووە و شەڕی ڕاگرتووە.
یا، « جەلال تاڵەبانیی »، لە گەرمەی جەنگی کاولکارانەی، نێوان هەر دوو دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق » و « ئێران »دا، ساڵی « 1983 - 1984 » جیا لە پارتەکانی دیکەی « بەرەی کوردستان »، گفتوگۆی لەگەڵ سەرکردایەتی پارتی « بەعس »دا کردووە و لە گوتاری جێژنی « نەورۆز » لە « سورداش »، زۆر بە ڕاشکاویی گوتوویەتی: ئێمە، لە پشتەوە خەنجەر لە سوپای « عێراق » نادەین!!!
یا، ساڵی « 2004 »، لە کۆنگرەی « کۆمەڵەی خوێندکارانی کوردستان » و لە « قەلاچوالان »گوتی: (ئێستە « کوردستان »، وەک سەربەخۆ وایە. ئێمە، هێندێ لەو سەربەخۆییەی خۆمان دەگێڕینەوە، دەیدەینەوە بە « عێراق ».)
ئایا، ئەمە « کوردایەتیی » و « کوردستانچێتیی » پێ دەڵێن؟!! ئایا، گەر سەرکردەی گەلێکی ژێردەس، بەو جۆرە بیربکاتەوە، دەتوانێ، گەلەکەی لە کەناری ئازادیی نزیکخاتەوە؟!! ئایا، سەرکردەی گەلانی بندەسی دیکەش، کاتێ سوپای داگیرکەری نیشتمانەکانیان، بە جەنگێکی لاوەکیی دیکەوە خەریکبووبێ، جەنگە سەرەکییەکەی نێوان خۆیان و دەوڵەتە داگیرکەرەکەیان وەستاندووە؟!! ئایا، سەرکردەی گەلانی بندەسی دیکە هەوڵیانداوە، لە سەربەخۆیی گەلەکانی خۆیان بدەنەوە و بە قورگی نەهەنگی دەوڵەتە داگیرکەرەکەیاندا بکەن؟!! ئایا، کەس دیوێتی، بەردی بنچینەی دەوڵەتی داگیرکەری نیشتمانەکەی هەڵوەشێتەوە، سەرانی کورد، بە هەموو توانایانەوە هەوڵبدەن، بناغەیەکی پتەوتری بۆ دابڕێژنەوە؟!!
جا گەر ئەوڕۆ سەرکردایەتی کورد بە گشتیی، « بارزانیی » و « تاڵەبانیی » بە تایبەتیی، لە ئاستی پێویستدا بوونایە. ئەرکە نەتەوەییەکانی سەر شانی خۆیان، بە ڕێکوپێکی جێبەجێکردایە، لە بەردەم ڕۆڵەکانی کورد، خوێنی شەهیدان و مێژوودا، هەستیان بە بەرپرسیاریی و لێپرسینەوە بکردایە، هەڵبەتە. ڕۆڵەکانی گەلی کورد، ئەو ڕۆژەڕەشانەیان نەدەبینی، ڕەوشی

نەتەوەیی و ڕامیاریی « کوردستان »یش، بەو بارە نالەبارە نەدەگەیی! ئاخر، کاتێ لە شاخ بوون، بە حسێبی خۆیان، دژی سوپای داگیرکەری « عێراق » دەجەنگان، کەچیی، دە ساڵی ڕێک، بە جەنگی نێوخۆوە خەریکبوون! من نازانم، ئەو سەرکردە زۆر دڵسۆزانە، بۆ کوردکوژیی، شاخیان لە دوژمنی داگیرکەر گرتبوو؟!! تەنانەت، دۆست و دوژمن، تانەی لێدەدان، هیچ کەڵکێکی نەبوو، ئەو جەنگە چەپەڵەیان، هەر ڕا نەدەگرت!
وە نەبێ، سەرکردەی ئەو پارتانە، پەندیان لە مێژووی خوێناویی و پڕ لە شەرمەزاریی، ئەو دە ساڵەی جەنگی نێوخۆی شاخ وەرگرتبێ، بەڵکوو، کاتێ بەشێکی زۆری « باشووری کوردستان »یش ئازادکرا و دەسەڵاتی دەوڵەتی نێوەندیی تێدا نەما، هەر دوو پارتی دەسەڵاتدار، لە سەر پارە و کورسیی، لە شاریش، لە گیانی یەکدی بەربوونەوە، جەنگێکی چەپەڵی نێوخۆییان بەرپاکرد، چوار ساڵی ڕێکی خایاند، بە هەزاران ڕۆڵەی کوردیان برسیکرد و بەکوشتدا، دۆست و دژمن، هاواریان لێ هەستا و داوایان لێ کردن، ئەو جەنگە پڕخڵە ڕاگرن، بەڵام، هیچ کەڵکێکی نەبوو، تا، دەوڵەتێکی زلهێزی وەک: « ئەمێریکا » فریاکەوت و پێی ڕاگرتن! تۆ بڵێی، سەرکردەی گەلانی بندەستی دیکەی جیهانیش، هەر بەو شێوەیە، ڕەفتاریانکردبێ، بۆیە ڕزگاریانبووبێ و بە ئامانجە نەتەوەییەکانی خۆشیان گەیشتبن؟!!
ئاخر، سەیر ئەوەیە، سەرکردەکانی دەوڵەتی « ئیسرایل »، هەمیشە، بە دوای هەلێکدا دەگەڕێن، دەس لە دوژمنە سەرەکییەکانی خۆیان بوەشێنن. چونکە، هەلی مێژوویی، بۆ گەلە بچووکە بێ پشتوپەنا و بێ تواناکان، وەک ئەوە وایە، مردوویەک لە گۆڕدا زیندووبێتەوە! کەچیی، سەرکردەکانی کورد، بە دوای هەلێکدا وێڵن، تا، جەنگی نێوخۆ هەڵگیرسێنن، تۆڵە لە یەکدی بکەنەوە و کوڕی کورد، بە خۆڕایی بە کوشتبدەن!

* * *

## ناميلكه و پەرتووكه چاپكراوەكانى نووسەر

1. دەربارەی پرۆژەکەی یەکێتی نیشتمانیی کوردستان، چاپی1، سوید، 1994.
2. دوا پرۆژە، چ.1، سوید، 1994.
3. پێنج وتاری غەمگین، چ.1، سوید، 1994.
4. دیموکراسی، ئایدۆلۆژی و جەنگی نێوخۆ، چ.1، سوید، 1994.
5. ململانێی ئایدۆلۆژی لە کوردستاندا:
   چ.1، سولەیمانی 1993.
   چ.2 ، سوید، 1995.
6. پێنج کاتژمێر لەگەڵ برایم ئەحمەددا:
   چ.1، سوید، 1995.
   چ.2، سولەیمانیی 1996.
   چ. 3، سولەیمانیی، 2002.
7. نامەیەکی درێژ بۆ نەوشیروان مستەفا، چ.1، سوید، 1995.
8. کورد و شۆڕش و هەڵی مێژوویی:
   چ.1، سوید، 1996.
   چ. 2، کوردستان، 2000.
9. فیدرالیزم و دەوڵەتی فیدراڵ:
   چ.1، سوید، 1996.
   چ.2، سولەیمانی، 1996.
   چ.3، سولەیمانی، 2004.
10. بەڵێ لێکۆڵینەوە و رەخنە نەک شێواندنی راستیی، چ.1، سوید، 1996.
11. خولانەوە لە بازنەیەکی بۆشدا:
   چ.1، سوید، 1997.
   چ.2، سولەیمانیی، 2002.
12. رۆڵی سیستیمی بنەماڵە لە بزاڤی رزگاریخوازی نیشتمانیی کوردستاندا:
   چ.1، سوید، 1997.
   چ. 2، سولەیمانیی، 2001.
13. گیروگرفتە سەرەکییەکانی کورد:
   چ.1، سوید، 1998.
   چ. 2، سولەیمانیی، 2000.
14. ئۆجەلان ئەزموونێکی نوێ و پەندی مێژوویی:
   چ.1، سوید، 1999.
   چ.2، سولەیمانیی، 1999.

15. سەلیقەی زمانەوانیی و گرفتەکانی زمانی کوردیی:
چ.1. سولەیمانیی، 1999.
چ.2. سولەیمانیی، 2005.
16. خلتەی بیرێکی ژاراویی، چ.1، سولەیمانیی، 2000.
17. مەسعورد محەمەد و دوو دیداری دۆستانە، چ.1، سولەیمانیی، 2002.
18. دیدی نەتەوەیی و نانەتەوەیی، چ.1، سولەیمانیی، 2002.
19. پەیانێکی رەش و رۆژێکی سوور، چ.1، سولەیمانیی، 2003.
20. سنوورە قەدەغەکان مەشکێنن:
چ.1، کوردستان ـ سولەیمانیی، 2003.
چ.2، سولەیمانی، 2004.
21. یاقووت و زمڕووتی کوردیی، بەرگی1، چ.1، سولەیمانیی، 2003.
22. شەکرە شارەکەم سولەیمانی، چ.1، سولەیمانیی، 2003.
23. حەوت گوتاری قەدەغەکراو، چ.1، چاپخانەی نەزمی، سولەیمانیی، 2004.
24. یاقووت و زمڕووتی کوردیی، بەرگی 2، چ.1، سولەیمانیی، 2004.
25. ئێمە بۆ واین؟ چ.1، چاپخانەی سیما، سولەیمانیی، 2005.
26. برایەتی درۆزنانە، چ.1، چاپخانەی سیما، سولەیمانیی، 2005.
27. دڵ و قودسی کوردستان، چ.1، چاپخانەی سیما، سولەیمانیی، 2005.

* * *

## بەرهەمی داهاتووی نووسەر

1. یاقووت و زمڕووتی کوردیی، بەرگی سێیەم.
2. یاقووت و زمڕووتی کوردیی، بەرگی چوارەم.
3. یاقووت و زمڕووتی کوردیی، بەرگی پێنجەم.
4. ئایین و نەتەوایەتی.
5. بەرکۆڵێ لە خەرمانی بیری نەتەوەیی.
6. ناکۆکیی و ناپاکیی لە مێژووی کورددا.
7. جیۆپۆلیتیکی کوردستان.
8. بە ڕاشکاویی.

لە ڕاستییدا، شاری (کەرکووك)، لە هیچ شارێکی دیکەی ئەم جیهانە ناچێ، لەبەرئەوە، نە (دڵ)ە، نە (قودس)ە و نە (بڕۆکسل)یشە، بەڵکوو، وەك هەموو شارێکی دیکەی ئاسایی (کوردستان) وایە، بەڵام، پێش ئەوەی، شارێکی (عێراقیی) بێ، بە شـــارێکی دێرینی (کـــوردیی) و (کوردستانیی) دادەنرێ.

گرنگ ئەوەیە، سەرکردەکانی (پارتیی) و (یەکێتیی)، وازی لێ نەهێنن، (ڕیفراندۆم)ی لە سەر نەکەن و لەکیس کوردی نەدەن، چونکە، ئەوەی لە ماڵی خۆی دڵنیابێ، شێر و خەتی لە سەر ناکا!

---

# KURDS & KIRKUKS PROBLEM

## A KRITICAL STUDY

Dr. HUSSEIN M. AZIZ

2005/2705K